چاپی دووەم
2010

سایە





پۆڵ ستراتێرن

وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

# ساتێک لەگەڵ دیکارت

زنجیرەی ناسینی فەیلەسوفەکان

٦

# ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی

# سایە

ناوەنیشان: سلێمانی – سابونکەران – تەنیشت شوقەکانی تەکیە رووتە

٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤ - ٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣

پۆل ستراتیڕن

# ساتێك لەگەڵ دیكارت

وەرگێڕانی بۆ كوردی: عەلی ئەكبەر مەجیدی


چاپی یەكەم

٢٠١٠

سلێمانی

# ساتێك لەگەڵ دیكارت


پۆل ستراتێرن

وەرگێڕانی بۆ فارسی: هوومەن ئەعرابی

وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی ئەکبەر مە ـیدی

تایپ: ئانیتا

چاپی: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٠

ئەژمار: ١٠٠٠

نـــرخ: ٢٠٠٠ دینار

---

ساتێك لەگەڵ دیكارت / پۆل ستراتێرن ، وەرگێڕانی: بۆ فارسی هوومەن ئەعرابی ، وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی ئەکبەر مەجیدی-

شوێنی چاپ و بڵاوکردنەوە: ناوەندی سایە

دیزان و نەخشە سازی: ناوەندی سایە

چاپی یەکەم : ٢٠١٠ ز — ١٤٣١ ك

---

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ( ١٨٨٨ ) ی ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێ دراوە.

# پێرست

بابەت ــــــــــــــــــــــــــــــــ لاپەڕە

## پێشەکی

لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمی زایینی دا، فەلسەفە لە جوولە راوەستابوو، ئەمجارەیان دیکارت ئیرادەی زیندبوونەوەی فەلسەفەی کردو جوولەی پێدا.

فەلسەفە بۆ یەکەمین جار لە سەدەی شەشەمی پێش زایین دەستی پێکرد. پاش دوو سەدە دوای ئەوە چەندین فەیلەسوف بەناوبانگ بە ناوی سوقرات، ئەفلاتون و ئەرەستۆ بیرۆکەی نوێیان لە فەلسەفەدا خولقاندو دەرکەتن، ئەم سەردەمە بووە سەردەمی ئالتۆنی بۆ فەلسەفە. پاشان تا دوو هەزار ساڵ پاش ئەوە هیچ رووداوێك لە فەلسەفەدا روویندا. بە واتایەکی تر لەم سەردەمەدا کارێکی گرنگی ئەنجام نەدا.

هەڵبەت لەم سەردەمەدا فەیلەسوف زۆر هاتنە ناو فەلسەفەوە. لە سەدەی سێیەمی زایینی دا "فلوتین" خەڵکی ئەسکەندەرییە" هەندێ گۆڕانکاری لە فەلسەفەی ئەفتلاتون دا کردو لەم رەوتەدا فەلسەفەی نوێ ئەفلاتونی هاتە ئارا. پاشان "سنت ئاگۆستین" کە خەڵکی "هیپۆ" بوو لە فەلسەفەدا دەرکەوت کە فەلسەفەی نوێ ئەفلاتونی لەگەڵ ئەو پێوانانەی گونجاوە لەگەڵ مەسیحیەتدا رێکی بخات. "تۆماس ئاکوێناس" بەش بە حاڵی خۆی ئەم فەلسەفەیە

لەگەڵ ئیلاهیاتی مەسیحی دا هەماهەنگ کرد. ئەم چوار کەسایەتییە سەربەخۆوە، هەر یەکەو بە شێوەیەك کاریگەریان لە سەر پێشکەوتنی فەلسەفە دانا، بەڵام هیچ کامەیان فەلسەفەیەکی نوێیان دانەهێنا. زیاتر کارەکانیان پەراوێزنووسی و شرۆڤەو لێکدانەوەی فلەسەفەی ئەفلاتون و ئەرەستۆ بوو. لەمڕووەوە فەلسەفەی ئەم دوو فەیلەسوفە لە سەردەمی بت پەرەستی و گوماندا بووە بنەمایەك بۆ فەلسەفەی ئایینی کڵێسای مەسیحی. هەر ئەم گۆڕینی پێناسەی فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرەستۆ بووە بنەمای سەرەکی پێکهاتەی فەلسەفەی وانە فەلسەفیەکان (سکۆلاستیك)، ئەم ناوە لە سەر چالاکییە فەلسەفیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دانرابوو. لەم سەردەمەدا ئامرازی هەموو جۆرە بیروڕایەکی نوێی فەلسەفی بەرەو پشکنینی بیروڕا دەچوو کە لە کۆتاییدا بە فەرمانی کڵێسای ئەو کات کەسەکە لە ئاگر دەسوتێنرا، وەك چۆن لە ئایینەکانی تردا بەردباران کردن هەیە. وردە وردە بیروڕای ئەفلاتون و ئەرەستۆ لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دەمی دەسەڵاتدارانی کڵێسادا ون بوون و ریشەی بیرکردنەوەی فەلسەفی وشك بوو. ئەم دۆخە لە لایەن بەرپرسانی کڵێساوە بە پێچەوانەی فێرکارییەکانی خودی (ئیسا) بوو، چونکە ئیسا دۆخێکی وای پەسەند نەدەکرد.

لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەم ئەم دۆخە خەفەتبارە تا رادەیەك لە هەموو بەشەکانی چالاکی بیرکردنەوەدا زاڵ بوو. لە سەرانسەری

ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست فەرمانکردن بە تەواوی لە لایەن کڵێساوە بوو، بەڵام هەر لەو کاتەوە یەکەمین کەلەبەرەکان لە پێکهاتەی شکۆداری فەلسەفەدا دەرکەوت. سەیر لەوەدایە کە بنەمای سەرەکی دەرکەوتنی ئەم کەلەبەرانە، هەمان دۆخی کلاسیکی (یۆنان و ڕۆما) بوو کە ئەفلاتون و ئەرەستۆ تیایدا چووبوونە ناویەوە. زۆربەی فێرکاریەکان کە لە سەدەکانی ناوەڕاست لە دەست چووبوون یان لە بیرکرابوون، دیسانەوە بووە هۆی زیندووبوونەوەو ئیلهامدەری ڕێنسانس (ژیانەوە)ی مرۆڤ. ڕێنسانس ڕوانگەی (مرۆڤ ئاراستەیی) یان (ناوەندگەرایی لە سەر بنەمای مرۆڤایەتی) لەگەڵ خۆی هێنا. ئەم ڕوانگەیە بزووتنەوەی "چاکسازی لە ئایین"دا بوو کە کۆتایی بە دەسەڵاتی کڵێسا هێنا. سەرەڕای ئەمەش پاش تێپەڕبوونی سەد ساڵ لەم ئاڵوگۆڕانە لە ئەوروپادا، هێشتا فەلسەفە لە چوارچێوەی پۆل و وانەوتنەوەدا گیرۆدە ببوو. ئەم دۆخە تەنها بە دەرکەوتنی "دیکارت" کۆتایی پێهات کە فەلسەفەیەکی گونجاو بۆ سەردەمی نوێ داهێنا. ئەوەندەی نەخایاند کە ئەم سیستمە فەلسەفییە لە سەرانسەری ئەوروپادا پەرەی سەندو تەنانەت بۆ ڕێزلێنانی ئەو، ناوی "دیکارت گەرایی"یان لە سەر دانا.

## ژیان و بەرهەمەکانی دیکارت:

دیکارت بە درێژایی تەمەنی لە سەر هیچ پیشەیەك سەقامگیر نەبوو. لە بۆنەی جۆراجۆردا خۆی بە سەرباز، یان بیرکاریزان، یان بیرمەند یان کەسێك لە بنەماڵەیەکی رەسەن بە خەڵك دەناساند. هەڵبەت ئەمەی دواییان زیاتر لەگەڵ شێوەی ژیان و بارودۆخی کۆمەلایەتییدا دەگونجا. ئارەزووی بۆ ژیانێکی ئارام و ئاسوودە لە سەردەمی گەنجێتیدا گۆڕا بۆ خوویەك. لە شوێنی تایبەت بە خۆی کە کاری سەربەخۆی دەکرد، بڕژێوی ژیانی دابین دەکرد. دەمەونیوەڕوان لە خەو هەڵدەستا و هەر کات پێی خۆش بوایە دەچووە گەشت و سەیران. هەموو ژیانی لەمەدا شرۆڤە دەکرێت. نە رووداوێکی گرنگ، نەش هاوسەرگیری، نەش سەرکەوتن یان شکستی کۆمەلایەتی گەورە. سەرەڕای ئەمەش بە بێ گومان دیکارت داهێنەرترین فەیلەسوفە کە تا پانزە سەدە پاش مردنی ئەرەستۆ دەرکەوت.

"رنــه دیكــارت" لــه (٣١)ی مارســـی (١٥٩٦)ی ز لــه شــاره بـچكولانەكەی "لاهـه"، كـه دەكەوێتـه سـێ كیلۆمـەتری باشووری شاری "توور" له هۆڵەندا. ئەم شوێنه ئێستا به ناوی دیكارت ناو نراوه. ئەگەر گەشتێك بۆ ئەوێ بكەین، دەتوانین ئەو خانووەی كه دیكارتی تێدا لەدایك بووه، ببینین. هەروەها دەتوانین كلێسای "سەنت جۆرج"ی تایبەت به سەدەی پانزەهەم كه دیكارت پاش لەدایكبوونی لەوێ له ئاو هەڵكێشرا، ببینین، ئەو شوێنه ئێستاش لەم شارەدا هەر ماوه.

"رنه" چوارەم منداڵی خێزانەكەیان بوو. دایكی پاش ساڵێك له دایكبوونی دیكارت، واته كاتێك منداڵی پێنجەمیان دەبوو- گیانی له دەستدا. باوكی كه ناوی "ژواكیم" بوو له دادگای باڵای بەریتانیادا دادوەر بوو. شوێنی دادگا له شاری بۆرن له (١٤٠) كیلۆمەتری شوێنی لەدایكبوونی دیكارت- ەوه بوو. لەمڕووەوە (ژواكیم) نیوەی ساڵەكەی له ماڵەوه تێدەپەڕاند. ژواكیم پاش ماوەیەك دوای مردنی هاوسەرەكەی دیسانەوه هاوسەرگیری كرد، (رنه) له ماڵی دایەگەورەی بەخێو كرا. لەم سەردەمەدا زیاتر له هەموو كات حەزی لە خزمەتكارەكەی خۆی كردو ئەم خۆشەویستیەی به باشترین شێوه پاراستو تا رۆژێك كه مرد، دیكارت بژێوی ژیانی دابین دەكرد.

دیكارت منداڵیی خۆی به گۆشەگیری به سەر برد، ئەوەش به هۆی مەزاجی كز و لاوازی خۆی بوو كه پەرەی بەم دۆخە دەدا؛

لەمڕووەوە خێرا فێر بوو کە بە چ شێوەیەك بە تەنها بژیت. وادیارە لە یەکەم ساڵەکانی ژیانیدا دەروونگەراو کەم قسە بووە:
منداڵێکی رەنگ پەڕیو بە قژێکی رەشی فڕ و چاوی گەورە کە چوو بووە چاڵا، شەبقەیەکی لیوارە پانو کوتێکی رەشو پانتۆڵێکو ملپێچ- ێکی خوری بە دەور ملیەوە لە ناو باخەکاندا پیاسەی دەکرد.
دیکارت لە تەمەنی هەشتساڵیدا چووە خوێندنگەی شەوانەرۆژی (یەسوٚع)یەکان کە تازە لە شاری "لافلێش" کرابووەوە. مەبەست لە کردنەوەی ئەم خوێندنگەیە، پەروەردەکردنی منداڵانی خێزانە دەوڵەمەندەکان بوو کە پێش ئەوە ئەو شوێنە بکرێتەوە، لەماڵەوە سەرقاڵی راگرتنی باڵندەی "باز"و سەرقاڵی شتی تر بوون وەك راوکردن. بەڕێوبەری خوێندنگەکە هاوڕێی خێزانەکەی دیکارت بوو، لەمڕووەوە لە خوێندنگەدا ژوورێك بۆ "رنە" دابین کراو هەروەها دەرەفەتی پێدرا هەر کات پێیخۆش بێت لە خەو هەڵبستێت، وەك هەموو کەسەکانی تر کە ئەو مافەیان هەیە، وادیارە دیکارت نزیکەی نیوەڕۆ لە خەو هەڵدەستا، واتە ئەو خووە کە تا دوای نیوەڕوان هەر لە سەری وەفادار بوو. لە حاڵێکدا خوێندکارانی تر لە لایەن یەسوٚعیەکان کە لە فەلسەفەدا شارەزا بوون، بە توندی تەمیە دەکران، دیکارت کە هوشیارو گەنج بوو، توانی لە دەخێکی ئاسوودەدا درێژە بە خوێندن بدات، کاتی نیوەڕوان لە خەو هەڵبستێتو دوای نیوەڕوان سەرقاڵی ئەسپ

سواری و یاری شمشێرو ژەنینی فلوت ببێت. کاتێك لە کۆتایی ساڵدا خوێندنگەیان بە جێدەهێشت وادیار بوو دیکارت زیاتر لە خوێندکارەکانی تر زانیاری لە وانەکانی دا بە دەست هێناوە، تەنانەت دۆخە مەزاجیەکیەی چاك بووەوە، (هەرچەند تا رادەیەك تووشی ئەوە ببوو کە خۆیی بە نەخۆش دەزانی، کە ساڵەکانی دوایی ژیانی ئەو دۆخەی تیا نەما و بە تەندروستی ژیانی بە سەر دەبرد.)

هەرچەند دیکارت لە کاتی خوێندنگەدا خوێندکارێکی زۆر باش بوو، بەلاّم وادیار بوو لە خوێندنەوەکانی رازی نیە. فێرکاریەکانی خوێندنگەی بەلاوە بێ بەها بوو: زانیارییەکانی ئەرەستۆ کە دوای ئەوەش لێکدانەوە و شیکردنەوەی سەدان فەیلەسوف پێ زیاد کرابوو، هەروەها ئیلاهیاتەکەی "ئاکۆیناس" کە بۆنی کۆنبوونی لێوە دەهات و بۆ هەر پرسیارێك وەلاّمێکی هەبوو، بەلاّم لە هەمان کاتدا وەلاّمی هیچ پرسیارێکی نەدەدایەوە. بە واتایەکی تر گەنکاوێکە لە متافیزیا. لە روانگەی دیکارتەوە هیچ یەك لە فێرکارییەکانی جیا لە بیرکاری، باوەڕی تیا نەبوو. دیکارت بە درێژایی ژیانی خۆی کە هیچ جۆرە گرێدراوییەکی بە خانوو، بنەماڵەو پەیوەندی کۆمەلاّیەتی واتاداری نەبوو، هەوڵیدا دڵنیابوون و باوەڕی خۆی تەنها لەو بوارانە کە خووی پێوە گرتبوو، واتە لە بواری زەین لێکۆڵینەوە بکات. بە نارەزایەتی خوێندنگەی بەجێهێشت، وەك سوقرات بەم ئەنجامە گەیشت کە

هیچ نازانێت. تەنانەت بیرکاری تەنها یەك توانای تیا بوو بەلایەوە کە باوەڕێکی جیای لە مرۆڤ هەبوو. تەنها شتێك کە جیا لە بیرکاری بڕوای پێ بوو، بوونی خوا بوو.

دیکارت کاتێك لە تەمەنی شانزە ساڵیدا خوێندنگەی "لافلێش"ی تەواو کرد، باوکی ناردیە زانکۆی "پواتیە" تا لەوێ یاسا بخوێنێت. "ژواکیم دیکارت" واتە باوکی پێیخۆش بوو کوڕەکەی لە پیشەی پارێزەریدا بگاتە ئاستێکی بڕواپێکراو، هەر بەوجۆرە کە برا گەورەکەی ئەو ڕێگایەی هەڵبژاردبوو. لەو سەردەمانەدا پیشە پارێزەری لە ڕێگای پەیوەندی خێزانیەوە بە دەست دەهات، سیستمی دادوەری بەو جۆرە کە لەم سەردەمەدا دەیبینین، لەو کاتەشدا دادوەری زۆری ناشایستەی پەروەردە دەکرد، بەلام دیکارت پاش دوو ساڵ خوێندن لە بەشی یاسادا بەو ئەنجامە گەیشت بە ڕادەی پێویست لەم زانستە شتێك فێر بووە. لەم کاتەدا چەند خانوو و میرات لە دایکی لە دیهات دا بۆی بە جێما. ئەم میراتە هەندێ داهاتی دەست کەوت کە بۆ ئەو شێوە ژیانەی ئەو دەیویست بەس بوو. لەمڕووەوە بڕیاری دا بۆ "بەدواداچوونی بیروڕای خۆی" بەرەو پاریس بڕوات. بنەماڵەی دیکارت لە ڕیزی ماڵە نەجیب زادەکان بە ئەژمار دەهاتن، چاوەڕێ ئەوەی لێنەدەکرا کاتەکانی خۆی بە بیرکردنەوە تەرخان بکات، بەلام ئیتر "ژواکیم"ی باوکی نەیدەتوانی کارێك بکات- چونکە ئیتر کوڕەکەی کەسێکی ئازاد بوو.

پاش تێپەڕبوونی دوو ساڵ، دیکارت لە ژیانی سەنتی و خۆشگوزەرانی خۆی لە پاریس هەستی بە هیلاکی کرد. هەرچەند سەرقاڵی خوێندنی بەربلاو و جۆراوجۆر بوو، هەروەها خەریکی نووسینی چەندین نامیلکەی جۆراوجۆر بوو، تا رادەیەك تووشی ژیانی کۆمەڵایەتی پایتەخت دەبوو کە هەستی بە شەکەتیەکی زۆر دەکرد. هەڵبەت وادیار نیە کە بۆچوونەکەی تایبەت بکرێت بە کۆمەڵگەی پڕ لە زریق و بریقی پاریس، بەڵکو وادیارە دیکارت هەموو جۆرە ژیانێکی کۆمەڵایەتی بە بێتاقەتکەر دەزانی، چونکە ئەم بێتاقەتیە بە پاریس- ەوە سنوردار نەدەکرایەوە. دیکارت ژیانێکی ئارامی لە "فوبۆرگ سەن جێرمەن" دەست پێکرد، کە هەراوهووڕای لێوە دوور بوو، واتە ئەو شوێنەی کە کەسێك فزولی بە سەر کەسێکی ترەوە نەدەکرد. لێرەدا زۆر بە تەنهایی دەژیا و دەیتوانی بە دوای بیرکردنەوەکانی خۆیدا بڕوات.

ڕەنگە دیکارت پێی خۆش بووە ئەم شێوە ژیانەی تا کۆتایی تەمەنی درێژە پێبدات، بەڵام پاش چەندین مانگ نیشتەجێبوون لەوێ، لەناکاو گەشتێکی بۆ خۆی رەخساند. لە راستیدا ژیانی دیکارت دوو ئاراستە کاریگەری لە سەر دانا:

١- ***گەشت کردن.***

٢- ***گۆشەگیری.***

گوایە بە درێژایی ژیانی لە نێوان ئەم دوو ئاراستەیەدا هاوسەنگییەکی دابین کرد. هەرگیز لەگەڵ هاوڕێکانی دا هەستی بە

نزیکی نەدەکرد، پێشی خۆش نەبوو لە لایان بێت، هەرگیز هەوڵی نەدا خانوویەکی سەقامگیر بۆ خۆی دابین بکات، تا کۆتایی تەمەنی تەنهاو بێقەرار بوو.

سەرەڕای ئەم دۆخەش، بڕیارێکی تری دا کە زۆر سەیر بوو، چونکە بڕیاری دا بڕواتە ناو سوپا. لە ساڵی (١٦١٨) چوو بۆ هۆڵەندا، لەوێ وەك ئەفسەرێکی بە بێ موچە لە سوپای شازادە "ئۆرانژ" ناوی خۆی تۆمار کرد. سوپای پروتێستانی شازادە ئۆرانژ بۆ بەرگری لە سەربەخۆیی یەکێتی هۆڵەندا لە بەرامبەر ئەسپانیای کاسولیك دا ئامادە دەبوو کە دەیویست وڵاتی هۆڵەندا وانە وڵاتی ژێر دەسەڵاتی پێشوی خۆی وەربگرێتەوە، لە راستیدا ئەم نەجیب زادە لە سەرخۆی کاسۆلیکییە کە تەنها تۆزێ ئەسپ سواری و شمشێری دەزانیو هیچ ئەزموونێکی نەبوو، کەی بە کەڵکی سوپا دەهات؟ دادوەریەکەی زۆر دژوارە. لەو کاتەدا دیکارت هەرگیز هۆڵەندی نەدەزانی، جیا لەوەش بە خەوتن تا دەمەونیوەڕۆ وەفادار مابووەوە. ڕەنگە هۆڵەندییەکان هەرگیز سەرنجیان نەدابایە، بۆ ئەو باش بوو، چونکە بەوپەڕی ئاسوودەییەوە دادەنیشتو دەستی بە نووسینەکانی دەکرد سەبارەت بە مۆسیقا یان هەندێ شتی تر. ئەگەر ئەمڕۆ بوایە دیکارتیان بە سیخوڕی تاوانبار دەکرد، بەڵام وادیارە کە لەو سەردەمەدا سوپاکان هیچ تێگەیشتنێکی باشیان لە سیخوڕەکان نەبووەو ئامادەی پەسەندکردنی هەموو سەربازێك دەبوون بە بێ

ئەوەی گوێ بە نەتەوە، رادەی وەفاداری یان تەنانەت ئارەزوویان بۆ بەشداری لە مەراسیمی سوپادا هەبوو بێت.

لە بەڵگەنامەکاندا وادیارە کە لە ژیانی سوپا بێزار ببوو، بە بۆچوونی ئەو ژیان لەوێدا "پڕ بوو لە بێکاریو کات بەفیڕۆدان". ئایا لە سوپادا ریزێك ئەفسەر بوون کە درەنگتر لە خەو هەڵدەستان؟ ئەگەر وابووە، سوپای ئەسپانیا دەستی بە هێرشێکی لەناکاو دەکرد دژی هۆڵەندییەکان، لەوانەیە تەنها روبەڕوی کۆمەڵێك کەسی سەرخۆش دەبووەوە کە بەرەو ناو جێیەکەی خۆیان دەڕۆیشتنو ئەفسەرێکی فەرەنسیان دەبینی کە بە تووڕەییەوە داوایان لێدەکات هێرشیان نەکەنە سەر و خەوەکەیان لێ تێکنەدەن.

دیکارت رۆژێکیان دوای نیوەڕۆ، پاش خواردنی نانی بەیانی بڕیاری دا لە شەقامەکانی شاری "بەردا" پیاسە بکات. سەرنجی راگەیەنراوێکی دا کە لە سەر دیوارەکەیان دابوو. لەو سەردەمەدا وا باو بوو کە مەسەلە چارەسەر نەکراوەکانی بیرکاری بە دیوارەکاندا هەڵواسنو خەڵکی بۆ کێبڕکێ بۆ چارەسەرکردنی ئەو هاوکێشانە بانگێشت بکەن. دیکارت ئەوەندە لە هاوکێشەکە تێنەگەیشت (چونکە بە زمانی هۆڵەندی نووسرابوو). لەمڕووەوە لە پیاوێکی بەڕێزی هۆڵەندی کە لە تەنیشتیەوە راوەستابوو، پرسیاری کرد ئەگەر دەکرێ مەسەلەکەی بۆ وەربگێڕێتەوە سەر زمانی خۆی. پیاوە هۆڵەندییەکە ئەوەندە گرنگی بەم ئەفسەرە

کەنج و سەڵتە فەرەنسیە نەدا و وتی تەنها بە مەرجێك دەتوانم ئەو مەسەلەیەت بۆ وەربگێڕمەوە کە بتوانی هاوکێشەکە شیکار بکەیت و وەڵامەکەم بۆ بهێنیتەوە. ئەفسەرە گەنجەکە سبەی دوای نیوەڕۆکەی رۆیشتە ماڵی پیاوە هۆڵەندییەکەو خانەخوێیەکە بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە تێگەیشت: نەك هەر مەسەلەکەی شیکار کردووە، بەڵکو شێوازێکی زۆر داهێنەرانەی بۆ ئەو شیکاریە بە کار هێنابوو.

"ئادرین بایە" یەکەمین ژیاننامەنووسی دیکارت، شێوازی چاوپێکەوتنی دیکارتی لەگەڵ "ئایزاك بیکمان" فەیلەسوف و بیرکاریزانی بەناوبانگی هۆڵەندی بەمشێوە وتوویەتی: ئەم دوانە تا ساڵانی دوایش هاوڕێیەکی زۆر نزیك بوون و بۆ ماوەی دوو دەیە بە بەردەوامی پێکەوە نامەیان دەگۆڕیەوە.

جارێکیان "دیکارت" نامەیەکی بۆ "بیکمان" نووسی: "من لە خەودا بووم، تۆ هاتیت و منت خەبەر کردەوە." هەر ئەو بووە هۆی ئەوە کە دیکارت حەز لە بیرکاری و فەلسەفە بکات و ببێتە هاندەری، چونکە لەو کاتەوە "لافلێش"ی بەجێهێشت ئیتر بە لای بیرکاریدا نەڕۆیشتەوە.

دیکارت پاش تێپەڕکردنی یەك و ساڵ و چەند مانگ کە لە سوپای هۆڵەندا بوو، بەرەو گەشتێکی هاوینە چوو لە ئەڵمانیا و بالتیك. لەم سەفەرەدا دیسانەوە بڕیاری دا ژیانی سەربازی ئەزموون بکات. هەر لەمڕووەوە بەرەو "نوبورگ" چوو کە شارێکی بچوکە لە

باشووری ئەڵمانیاو خۆی پەیوەست کرد بە سوپای "ماکسیمیلیان"و "دۆك باواریا" کە ئوردۆی زستانەیان سەربازییەکەیان لە کەناری لای سەرەوەی رووباری "دانوب" بە سەر برد. وادیار بوو ئەم قۆناخەش بە لای دیکارتەوە قورس بوو- بەجۆرە خۆی نووسیویەتی لە شوێنی گەرمو نەرم دا بە نیشتەجێ دەبوو و بە سەری دەبرد، خووی بەوە گرتبوو شەوان (١٠) کاتژمێر دەخەوتو دەمەونیوەڕوان لە خەو هەڵدەستا، کاتێك بە خەبەر بوو لەگەڵ بیرکردنەوەکانیدا بە تەنها بە سەری دەبرد.

بارودۆخی ئەورووپا وردە وردە تووشی قەیران دەبوو، هەرچەند ناکرێ ئەم مەسەلەیە لە روانگەی دیکارتەوە پێوانە بکەین. خەڵکی "باواریا" دژی "فردریکی پێنجەم" کە قایمقامی "پالاتین"و پاشای "پروتێستان" بوو بە شەڕ هاتن. سەرانسەری ئەورووپا بەرەو شەڕێکی درێژماوە و قەیراناوی دەچوو کە پاشان بە ناوی "شەڕی سی ساڵە" ناوبانگی دەرکرد. ئەم شەڕانە کە دەرەنجامە ناسەقامگیرەکانی هەموو وڵاتە ئەورووپیەکانی دوورگەیی تەنییەوە هەر لە سویید بگرە هەتا ئیتاڵیا، تا کۆتایی ژیانی دیکارت ئەم شەڕە درێژەی خایاندو ناوچەیەکی زۆر لە ئەورووپا بەتایبەتی ئەڵمانیای تووشی لەناوچوونو وێرانی کرد. سەرەڕای ئەمانەش وادیارە کە کاریگەری ئەم شەڕانە لە سەر ژیانی دیکارت تەنانەت کاتێك کە لە سوپادا بوو ئەوەندە دەرنەکەوتووە. هەرچەند ئەم ئەگەرە لە ئارادایە کە ناسەقامگیری سیاسی لەم سەردەمەدا لەگەڵ

نەبوونی پاڵپشتی دەروونی خودی دیکارت بە شێوەیەك یارمەتیدەر بووە بۆ پێداویستیە دەروونییە قووڵەکانی کە دەرەنجامی دڵنیاکەرەوەی بۆ بەدیهێناوە کە خاڵێکی بەرجەستەیە لە فەلسەفەکەیدا.

لەم نێوانەدا زستانی ساردی "باواریا" بەڕێوەبوو، سەرانسەر ئەو شوێنە بەفر دایگرتبوو. کەش و هەوای ناوچەکە بە لای دیکارتەوە ئەوەندە سارد بوو کە بڕیاری دا لە ئاگردانێکدا بژیت. مەبەستی دیکارت لە وشەی "ئاگردان"، ژوورێکی بچوکی گەرم بووە کە بە هۆی سۆپایەك لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا گەرم دەبووەوە، لە ناوچەی "باواریا" زۆر کەس وەك دیکارت بەمشێوە دەژیان، بەڵام دیکارت لە بیرەوەرییەکانیدا بە راشکاوی دەنووسێت کە "لە ناو ئاگردانێك"دا دەژیا.

رۆژێکیان دیکارت لە ئاگردانەکەی خۆی دانیشتبوو، وێنایەکی بە مێشکدا هات. بە رێك و پێکی روون نەبوو کە چی وێنا کردووە، بەڵام وادیارە کە ئەم وێنایە، وێنایەکی بیرکاری ئاسایە سەبارەت بە جیهان. لەمڕووەوە دیکارت رازی بوو کە دەکرێ هەموو پەیوەندییەکانی جیهان بە کەڵك وەرگرتن لە بیرکارییەکی گشتگیر بدۆزرێتەوە. ئەو شەوە کاتێك کە دیکارت چووە ناو جێیەکەی، سێ وێنای روون و راشکاو بە زەینیدا هات. لە خەوی یەکەمدا خۆیی بینی کە بەرەنگاری لە گەڵ (با)یەکی توندا دەکات و هەوڵدەدات بەرەو خوێندنگە کۆنەکەی خۆی دەڕوات کە لە

"لافلـیش" دا بـوو. بـۆ مـاوەی چـرکەیەك دەگەڕێتـەوە تـا لـە گـەڵ کەسێکدا چاکی چۆنی بکات و لەناکاو (با)کە دەیدات بـە دیـواری کڵێسایەکدا. ئەوسا لە حەوشـەی کڵێساوە دەنگێك دەبیـستێت کـە یـەکی لـە هاوڕێکـانی دەیـەوێت کاڵـەکێکی پێبـدات. لـە خـەوی دووهەمیدا ترس هەموو سـەراپای دیکارت دەگرێتـەوە و "دەنگێك وەك دەنگـی تونـدی زریـان" دەبیـستێت و پاشـان هـەزاران هـەورە تریشقە تاریکایی ژوورەکـەی رووناك دەکەنەوە. خـەوی سێهەمی دیکارت، ئەوەندە ئاشکرا نیـە: فەرهـەنگێك و کتێبێکـی هـۆنراوە لـە سەر مێزەکەی خۆی دەبینێت، بە دوایدا چەند روداوێك دەبینێت کە هیچ پـەیوەندییەکیان بە یەکەوە نیە، لە حاڵێکدا ئـەو روداوانە هێمادارن کە بە لای خۆیەوە زۆر دڵخۆشکەرە و بە لای بیسەرەکانی ناخۆشـە. ئنجـا دیکـارت لـە خەودکەیـدا بڕیـار دەدات هـەموو ئـەم رووداوانـە شـیبکاتەوە. دەربـڕینی ئـەم لێکدانەوانـە دەیتـوانی شێوەی ناسینی دیکارت بەرامبەر بە خۆی روون بکاتەوە، بەڵام بە داخەوە "ئادرین بایە" نووسەری ژیاننامەی دیکـارت لـەم دۆخـەدا لە رستەی پڕ واتا کەڵك وەردەگرێت.

رووداوەکـانی ئـەو رۆژە زسـتانیە و شـەوی دوایـی واتـە (١١ نۆڤەمبەری ١٦١٩) کاریگەرییەکی زۆر قووڵ و سەقامگیری لـە سـەر دیکارت دانا. خۆی بڕوای وابوو کە ئەم وێنا و خەونانە کە پاشان لـە زەینیـدا پێکهات، ئـەو ئەرکـە بـوو کـە لـە سـەر شـانی دانـراوە و ئاشـکرا بـووە. لـەمڕووەوە هەڵسەنگاندنی لەگـەڵ نـەبوو، متمانـەی

دۆزیەوە، ئەو متمانەیە کە زۆر پێویستی پێبوو. ئەگەر ئەزموونی ئەو رۆژەی نەبوایە، ئەم بلیمەتە گەنجە هەرگیز ئەو ئەرکەی لە سەر شانی نەدەدۆزیەوە کە پێش ئەوە بەردەوام لەم بیرۆکە بۆ ئەو بیرۆکە و لەم شوێن بۆ ئەو شوێن دەڕۆیشت. سەیر لەوەدایە کە فەیلەسوف ژیرگەرای گەورە وەك دیکارت ئیلهام لە وێنایەکی خەیاڵی و چەندین خەونی ناژیرانە وەربگرێت- هەرچەند ئەم لایەنە لە بیرکردنەوەکانی دیکارت زۆرجار لە خوێندنگەکانی فەرەنسی دا لە بەر چاو نەدەگیرا. ئەم بلیمەتە گەورە فەرەنسیە وەك نموویەکی بەرجەستەی ژیرگەرایی ناوی لێدەبرێت.

پێویست بەوە ناکات باسی بکەین کە خەونەکانی دیکارت لێکدانەوەی جۆراوجۆری لە خۆ گرتووە. بە بڕوای فەیلەسوف و ئەستێرەناسی هۆڵەندی، هۆیگێنس کە پاشان دیکارت نامەی لەگەڵ دەگۆڕیەوە، ئەم وێناکردنەوانە دەرەنجامی گەرم و گوڕی لە رادە بەدەری مێشکی دیکارت بوو کاتێك لە ئاگردانەکەدا دەژیا.

کەسانی تر چەندین هۆکار بۆ خەونەکانی دادەنێن وەك: باش هەرس نەکردنی گەدەی، کاری لە رادە بەدەر، کەم خەوی، ئەزموونی عیرفانی، یان تەنانەت پەیوەیست بوونی بە "رۆزیکرۆسین"ەکان(Rosicrucians= گروپێکی نێونەتەوەیین کە ئاراستەی بیرکردنەوەیان عیرفانییە).

ئەگەری زۆر هەیە کاڵەك لە خەوی یەکەمی دیکارت کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، بووەتە هۆی پێکەنینی ژیاننامەی دیکارت لە

سەدەی هەژدەهەمدا، بەلام بە دەسپێکی پشکواندنی زانستی دەروونشیکاری، هەر ئەم کاڵەکە بووە مەسەلەیەکی جدی. نامەوێ لەمبارەیەوە زۆر باسی وردەکاریەکان بکەم. تەنها ئاماژە بەوە دەکەم کە لە سەر بنەمای کەسێك کە بیروڕای خۆی لەمبارەیەوە دەربڕیوە، فرۆید "بە شێوەیەکی تر لێکدانەوەی بۆ کاڵەك دەکرد." دەرەنجام وێنای زەینی و خەونەکانی لەو رۆژ و شەوەدا وایکرد دیکارت سوێند بخوات لەوە بەدواوە هەموو ژیانی خۆی بۆ خوێندنەوەو بیرکردنەو تەرخان بکات، هەروەها بە مەبەستی سوپاسگوزاری چووە پەرەستشگەی خاتوو "لوریتۆ" لە ئیتاڵیا. لەمڕووەوە سەیر لەوەدایە کە دیکارت دوای پێنج ساڵ لە ئەوروپادا بە بێ ئامانج و بە سەرلێشێواوی ژیانی بە سەر دەبرد تا دەرەنجام چووە پەرەستشگەی خاتوو "لوریتۆ"، پاش ئەوەش دوو ساڵی تر وەك خۆی مایەوە تا دیسانەوە دەستی بە خوێندن کردەوە.

سەبارەت بەم خولە حەوت ساڵە لە ژیانی دیکارت کە خۆی ناوی "دەورەی بەرەڵڵایی" لە سەر دانابوو، ئەوەندە وردەکاریمان لە سەر نیە. ئەگەری زۆرە لە کاتی دەسپێکی ئەم سەردەمە چووبێتە سوپای پاشایەتی مەجاریستان، بەلام شەڕی سی ساڵە زۆر بە توندی دەستی پێکردبوو، دیکارت کە ئەفسەرێکی نەجیب بوو، لە شەڕە سەربازییەکاندا ئەوەندە خۆی دەرنەدەخست. پاش بەجێهێشتنی سوپا، دیکارت گەشتێکی کرد بۆ ولاتانی: فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، هۆڵەندا، دەنیمارك و پۆڵەندا- بە درێژایی ئەم

ماوەیە ئەو ناوچانە کە هاوکارە ئەرکاسەکانی لەوێ خەریکی شەڕ بوون، بە وردبینی هاتووچۆی دەکرد. هەڵبەت دیکارت بۆ هەلاتن لە توندوتیژی هەمیشە سەرکەوتوو نەبوو. کاتێک گەشتێکی کردبوو بۆ دوورگەکانی "فریزین= Frisian Ialands کە کۆمەڵە دوورگەیەکە لە دەریای باکوور"– ئەگەری زۆرە چووبێتە دوورگەی "شیرمونیکۆگ"، بەلەمێکی بە کرێ گرتبوو تا لە دوورگەکە بیپەڕێنێتەوە. مەلەوانەکان ئەویان بە هەڵە گرتبوو لە بری بازرگانێکی فەرەنسی، وایان دانابوو کە کەل وپەل و داراییەکەی بەرن. لە حاڵێکدا دیکارت لە سەر بەلەمەکە وەستابوو– سەیری کەناری دوورگەکەی دەکرد کە چۆن لە کەناری دەریا دوور دەکەوێتەوە، مەلەوانەکان بە شێوەزاری هۆڵەندی نەخشەیان بۆ دادەڕشت. نەخشەکەیان وابوو کە زەربەیەك لە سەری بدەن و بیخەنە دەریاوە، ئەو ئالتونانەش کە ئەگەریان دابوو لە جانتاکەی شاردبێتیەوە، بیشارنەوە. بە داخەوە مەلەوانەکان ئاگایان لەوە نەبوو کە ئەو کەسەی نەخشەیان بۆ داڕشتووە پاش چەندین ساڵ چەند وشەیەکی هۆڵەندی فێر بووە. مەلەوانەکان لەناکاو بینیان ڕووبەڕووی ئەو نەجیب زادە فەرەنسیە دەبنەوە کە بە شمشێرەکەی هێرشیان دەکاتە سەر و دێتە پێشەوەو دەڕواتە دواوە، دەرەنجام نەخشەکەیان شکستی هێنا.

لەم سەردەمەدا دیکارت بۆ جارێکی تر لە ساڵی (١٦٢٣) گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی "لاهە"و هەموو داراییەکەی فرۆشت. بە پارەی

ڕۆشتنی داراییەکەی دەستی کرد بە کڕینی سهام کە داهاتێکی زۆری بۆ بەدیهێنا کە تا کۆتایی تەمەنی لێ حەسایەوە. ڕەنگە لە گەشتەکانیدا بۆ وڵاتان بۆ جارێك سەردانی ماڵی خۆیانی کردبێت، بەڵام هۆکارێکی سەداسەد لە بەر دەستدا نیە بۆ ئەم کارە. دیکارت هەرگیز لەگەڵ بنەماڵەکەیدا شەڕی نەکرد، بەڵام بەردەوام لیان دوور دەکەوتەوە. سەرەڕای گەشتەکانی خۆی کە بە ئازادانە لە سەرانسەری ئەوروپادا دەیکرد، هەرگیز ئەو زەحمەتەی بە خۆی نەدا بەشداری بکات لە جەژنی هاوسەرگیری براکەی یان خوشکەکەی خۆی کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، تەنانەت کاتێك باوکی مرد لە سەر تەرمەکەی ئامادە نەبوو.

لە کۆتایی گەشتەکەیدا ماوەیەکی زۆر لە پاریس بە سەری برد. لێرەدا یەکێ لە هاوپۆلە کۆنەکانی خۆی بینی کە لە خوێندنگەی "لافلێش"دا پێکەوە بوون، ناوی "مارین مرسان" بوو کە بە کڵێسا پەیوەست ببوو. باوکی مرسان پلەی باڵای زانستی هەبوو، پەیوەندی لەگەڵ گەورەترین بیرمەندانی بیرکاریو فەلسەفەی ئەوروپادا هەبوو. مرسان لە ژوورێکی بچوك لە پاریس دەژیاو پەیوەندی لەگەڵ بلیمەتەکانی ئەو سەردەمەدا وەك: پاسکاڵ، فرما، گاسەندی دا هەبوو. ژوورەکەی مرسان ببووە شوێنێك بۆ گۆڕینەوەی دوایین بیرکردنەوەکانی بیرکاری، زانستیو فەلسەفی. مرسان هەمان ئەو کەسە بوو کە دیکارت پێویستی پێبوو، لەمڕووەوە تا کۆتایی تەمەنی بە نامە پەیوەندییان پێکەوە بوو،

بیرۆكەكانی خۆی بۆ ئەو دەنارد تا بیروڕای مرسان لەو بارەیەوە بزانێت، تا بزانێت ئایا بیرۆكەكانی تا چ ئاستێك پتەون‌و تواناییان هەیە.

دیكارت زۆربەی كاتەكانی خۆی لە پاریس بە خوێندنەوە بە سەر دەبرد، بەڵام جارناجار چەندین هاوڕێ بۆ باسكردن لەبارەی مەسەلە جۆراوجۆرەكان بۆ بینینی دەهاتن‌و تەنانەت هەندێ جار ناچار بوو ماڵی بەجێهێشت‌و لە شوێنە فەرمیەكانی تردا بەشداری بكات. دەیگێڕنەوە دەڵێن جارێكیان كاتێك دیكارت لەو شوێنەی كە باڵوێزی "پاپ" لەوێ نیشتەجێ بووە، پزیشكێك بە ناوی "شاندۆ" لەوێ ئامادە بووە هەوڵیداوە "فەلسەفە نوێ"یەكەی خۆی بە خەڵك بناسێنێت. لە كۆتایی قسەكانیدا دیكارت لە سەر چەندین بنەمای بیركاری كە شاندۆ هیچ ئاگادارییەكی لەوبارەیەوە نەبوو، فەلسەفە نوێیەكەی شاندۆی ڕەتكردەوە. شاندۆ پاش سێ ساڵ تووشی دۆخێكی تری وابووەوە؛ بەڵام ئەمجارەیان بەوە تاوانبار كرا كە هەندێ شتی تەزویر كردووە كە لە بیروڕای فەلسەفی قورس بوو، دەرەنجام لە سێدارە درا. "كاردیناڵ دوبرو" پاش بیستنی هەڵسەنگاندنەكانی دیكارت كە زۆر بە كارامەییەوە سەرنجی دابوو، ئەوی بانگ كردە سووچێك‌و بە پێداگری داوای لێكرد هەموو تەمەنی خۆی بۆ كاری فەلسەفە تەرخان بكات.

ئەم ڕووداوە بە لای دیكارتەوە كاریگەر بوو. هەڵبەت وێنای زەینی و خەونەكانی پێشتر لە بوونیدا متمانە بە خۆبوونی پێویستی

دابین کردبوو، بەڵام دەرەنجام پێویستی بە بیرۆکەیەکی ژیرانە هەبوو تا هانی بدات بۆ ئەو کارە. دیکارت لە ساڵی (١٦٢٨) لە پاریس بەرەو باکووری فەرەنسا رۆیشت تا لەوپەڕی تەنیاییدا بە تەواوی خۆی بۆ بیرکردنەوەکانی تەرخان بکات، بەڵام بە داخەوە هاورێیەکانی کە خەڵکی پاریس بوون، دەهاتن بۆ دیداری. لەمڕووەوە بڕیاری دا بەرەو شوێنێکی دوورتر بڕوات، ئنجا رۆیشتە هۆڵەندا تا بە تەواوی تەنیا بێت. بۆ ماوەی دوو دەیە لە هۆڵەند ژیا، واتە تا یەك ساڵ پێش مردنی لە هۆڵەندا بوو.

هەڵبەت نیشتەجێبوون لە شوێنێك لە روانگەی دیکارت، واتایەکی رێژەیی هەبوو. لە سەر بنەمای زانیارییەکان لە پانزە ساڵی یەکەم خۆی لە هۆڵەندا لانیکەم هەژدە جار ماڵی گۆڕی، تەنانەت لەم سەردەمەدا هەرکات هەستی دەکرد ژیانی لە سەر یەك رەوت دەڕوات و ئاڵوگۆڕی تێدا نیە، بەرەو وڵاتێکی تر دەڕۆیشت. تەنها کەسێك ئاگاری لە شوێنی نیشتەجێبوونی بوو، باوکی مرسان بوو، بە هەر حاڵ هیچ کەس ئاگای لە گۆشەگیریەکەی نەبوو. ئەم شوێن گۆڕکێیە بەردەوامانە تەنها لە دۆخی دیکارتدا بوو، بەڵام وادیاربوو لەو سەردەمانەی ماڵ بە کوڵ بوو- بێ ئۆقرەییەکی زۆری تیا شارابووەوە. لەم گەشتانەیدا تەنانەت لە کاتی ماڵ گواستنەوەکانیدا ناکرێ لە هەموو خەڵك خۆت بە دوور بگریت، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیوەندییانەش زۆر کەم بوایان. ئەم شوێن گۆڕکێیانەی دیکارت کە کۆتاییان پێنەدەهات پیشاندەری ئەوەیە

کە دیکارت لە گۆشەگیری تەواودا ئاسوودە نەبووە. بە تەنها بوو. بەڵام زۆر بە دەگمەن پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا هەبوو.

دیکارت هەمیشە لە ماڵەوە خزمەتکاری هەبوو، وادیار بوو کە هەڵسوکەوتی زۆر باش بووە. ئەو بیرکردنەوەیە سەبارەت بەو هەمانە، کەسێکی نەجیب زادەیە کە روخسارێکی رەنگ پەڕیو و بارۆکەیەکی درێژ و تۆخی هەبوو کە لەو رۆژگارەدا باو بووە. سمێڵ و ریشێکی باریك و درێژ کە سەرنجڕاکێشیەکی نهێنی ئاسای پێدەبەخشی. دەڵێن جلی زۆر کەشخەی لە بەر دەکرد، پانتۆڵی کورت و گۆرەوی ملیوان درێژی ئاورێشمی رەش و پێڵاوێك کە نقیمی زیوی لە سەر دانەخشێنرا. خووی بەوە گرتبوو ملپێچی ئاورێشمی لە مل بکات تا لە بەرامبەر سەرما بیپارێزێت. هەرکات لە ماڵ دەچووە دەرەوە، کۆتی ئەستوور و ملپێچی ئاورێشمی لە بەر دەکرد و بەردەوام شمشێری لە کەمەر دەکرد. دیکارت لە بەرامبەر بچوکترین گۆڕانکاری کەش و هەوادا هەستیار بوو، خۆی وتەنی سەرما بۆ "لاوازی سنگی کە بە بۆماوەیی بۆی مابووەوە. زیانی هەبوو. سەرەڕای ئەمانەش بە درێژایی ساڵانێك زۆر تەمەنی خۆی بۆ گەشت کردن بۆ سەرانسەری ئەوروپا، لە ئیتاڵیا بگرە هەتا ئەسکەندیناڤیا. دەرەنجام ئەو وڵاتەی کە بۆ نیشتەجێبوون هەڵیبژارد، هۆڵەندا بوو کەبە هۆی باران، تەم و مژ و بەستەڵەك ناوبانگی هەبوو. کەسێکی فەرەنسی کە لە سەردەمی دیکارت دەژیا لەبارەی کەش وهەوای ئەم وڵاتە دەڵێت: "چوار مانگ

زستانه، ئنجا به دوای ئەوه هەشت مانگ سەرما دەست پێدەکات."

سەرەڕای ئەمەش هۆڵەندا تایبەتمەندییەکی زۆر گرنگی هەبوو. ئەم ناوچەیە لە سەدەی هەڤدەی زاینیدا بە ناوەندی ئازادی ئەوروپا دەناسرا. بە پێچەوانەی ولاتانی تر لە هۆڵەندا کەسێك بە هۆی بیرورِایەوە باجی نەدەدا. هۆڵەندییەکان کە ژیانیان باش بوو، هیچ حەزیان لە پشکنینی بیروڕا، تاوانبارکردنی بیرۆکەکانو سوتاندنو لە سێدارەدانی خاوەن بیروڕاکان نەبوو. ئەمانە بە تایبەتمەندیی گرنگ دەژمێردران کە بیرمەندە خاوەن بیرۆکەی نوێ لە سەرانسەری ئەوروپاوە بەرەو هۆڵەندا سەرنجی رادەکێشان. لە نێو ئەو چوار بیرمەندە گەورەیە کە لە سەدەی هەڤدەهەمدا بیرۆکەی فەلسەفی نوێیان خستەڕوو، سێ کەس واتە: دیکارت، ئەسپینۆزا و لاك، زۆربەی تەمەنیان لە هۆڵەندا بە سەر برد. (چوارەمین بیرمەند واتە: لایب نیتس، لە سەر سنوری هۆڵەندا واتە لە (هانۆڤێر) دەژیا، چەندین جار بۆ هۆڵەندا رۆیشتبوو.) تا رادەیەك هەر بە هۆی ئەو بارودۆخە ئازادە بۆ بیرکردنەوە، هۆڵەندا بووە ناوەندێکی گرنگ بۆ چاپو بڵاوکردنەوە، بەرهەمی کەسانێکی گەورە وەك: گالیلۆ و هاپز لەوێ لە چاپ دران. لەم سەردەمەدا هیچ شوێنێك لە ئەوروپا بە قەد ئەوروپا بیرۆکەی نوێی تیا دەرنەکەوت.

دیکارت لەم سەردەمە گرنگەی ژیانیدا بە ئومێدێکی زۆرەوە دەستی پێکرد. لە ئەنجامی ئەو ئاگردانەی کە "باواریا" بینیبووی، بیرۆکەی زانستێکی گشتگیری لە مێشکیدا پەروەردە دەکرد کە هەموو زانستە مرۆییەکانی لە خۆ دەگرت. ئەم زانستە دەیتوانی ڕێگای بە دەستهێنانی ڕاستییەکان ئاسان بکاتەوە لە ڕێگایەکی ژیرانەیە. ئەم زانستە دۆخێك بوو لە سەرووی شێوازی نوێ‌و شۆڕشیانە. لە زانست‌و کیمیاگەری سەدەکانی ناوەڕاست، ژێری دۆخێکی زۆر لاوەکی هەبوو. دیکارت سیستمێکی لە زەینی خۆیدا بەخێو دەکرد کە نەك هەر هەموو زانستی مرۆیی لە خۆ بگرێت، بەڵکو ئەو زانستە پێکەوە بکات بە یەك. ئەم سیستمە بێبەری بوو لە هەموو جۆرە مەرجی سەرەتایی یان پێش دادوەری، تەنها لە سەر بنەمای باوەڕ بنیات دەنرا. دیکارت بۆ دابینکردنی ئەم سیستمە کارەکەی لە سەر بنەمایەکی بنەڕەتی دەست پێکرد کە دەسپێك بوو، پێویستی بە سەلماندن نەبوو، لە سەر ئەم بنەمایانە سیستمەکە بنیات دەنرا.

دیکارت وایدادەنا کە لە سیستمە فەلسەفیەکەی سوودێکی زۆر بە دەست دێت. بە دڵنیاییەوە پێشبینی دەکرد هەرکات ئەم شێوازە زانستیە نوێیە پزیشکیە بە کار بهێنرێت، دەتوانێ پیربوون دوا بخات. ئەمە خەونی هەمیشەیی دیکارت بوو. پاش دە ساڵ نامەیەکی بۆ بیرمەندی هۆڵەندی نووسی کە ناوی "هۆیگێنس" بوو، سەرەڕای بارودۆخی جەستە لاوازەکەی، چاوەڕێ دەکرد

زیاتر لە سەد ساڵ بژیت. هەرچەند لە دوایین ساڵەکانی تەمەنیدا ناچار بوو بە بۆچوونەکانیدا بچێتەوە.

دیکارت دەستی کرد بە نووسینی "نامەیەك لەبارەی ڕێساکانی ڕێنمایی زەین"، بە مەبەستی دۆزینەوەی زانستی گشتگیر، سەرەتا دەبوایە شێوازێك بۆ باش بیرکردنەوە بدۆزێتەوە. ئەم شێوازە لە ڕاستیدا بریتی بوو لە پارێزگاری کردنی دوو ڕێسا لە جێبەجێکردنی زەیندا: شایەتحاڵی هەڵسەنگاندن. دیکارت بەمشێوە لێکی دایەوە: "تێگەیشتنێك کە گومانەکەی لە زەینێکی ڕووناك و هوشیارەوە دوورە کە تەنها لە بەر ڕووناکایی ژێریدا جێبەجێ دەکرێت." بەمشێوە تێگەیشتن لێکدەداتەوە: دەرەنجامێکی زۆر پێویست لەو ڕاستیانەی کە ڕاستبوونیان بڕواپێکراوە." شێوازی بەناوبانگی دیکارت کە پاشان بە شێوازی دیکارتی (Cartesian) ناوبانگی دەرکرد. بۆ بەکارهێنانی ئەم دوو ڕێسا بیرمەندانەیە لێکدەدرێتەوە.

وردە وردە دیکارت ناوبانگێکی باشی لە بواری مەسەلە جۆراوجۆرەکانی فەلسەفەو زانستدا بە دەست هێنا. لە مارسی ساڵی (١٦٢٩)، (پاپ)و هەندێ لە کاردینالە گەورەکان سەرنجی هەندێ گۆی و شتۆمەکی تریان دایەوە لە ئاسمانی شاری ڕۆما. بە دەرکەوتنی شەو، ڕووناکاییەك وەك ڕووناکایی دەوری مانگ لە ئاسمان دەرکەوت کە خاڵێکی زۆر درەوشاوە بە دەوریدا

دەسوڕایەوە. چەندین نامە بۆ دیکارت و بیرمەندانی تر نێردرا تا بیرورای خۆیان لەوبارەیەوە بڵێن.

دیکارت ئەوەندە لە مەسەلەکەدا قووڵ بووەوە کە بۆ ماوەیەك هەموو بیرۆکە فەلسەفییەکانی خۆی وەلاناو بیری لەم مەسەلەیە کردەوە. سەبارەت بە هۆکاری ئەم جۆر دیاردانە چەندین بیرۆکەی بە دەست هێنا، بەلام ئەوەندەی نەخایاند تا ئەوانەی بلاو کردەوە. لەم کاتەدا دیکارت نامیلکەیەکی تەواوی سەبارەت بە دیاردە ئاسمانیەکان نووسی. لەم ماوەیەدا کلێسای ڤاتیکان بیرۆکەیەکی تازەی دۆزیبووەوە: هۆکاری ئەم دیاردانە ئەو فریشتانە بوون کە دیمەنی ئاسمانیان بۆ دەرکەوتنی مەسیح ئامادە دەکرد.) دیکارت بڕوای وابوو کە ئەم رووناکییە ئاسمانیانە لە رێگای بەردە ئاسمانیەکان پێکدێن. بە داخەوە زانایانی سەردەمی نوێ هەندێ بیرۆکەیان بۆ ئەم دیاردە خستووەتەڕوو کە تەنانەت لە بیرۆکەی ڤاتیکان نالۆژیکی ترە. ئەم دیاردانە ئێستا بە خۆری روتینی بەناوبانگن. لە سەر بنەمای بیرۆکەی نوێ، ئەم دیاردانە کاتێك روودەدەن کە رووناکایی خۆر لە ناوەوەی هەورێکی ئەستوور بە سەر زەویدا بلاو دەبێتەوە کە پێکهاتووە لە بلۆری سەهۆڵی (شەش لۆ) کە ئاراستەی هاوشێوەییان بە شێوەی شاولییە. ئەمڕۆکە زیاتر ئەگەری لە ئاردایە کە هەندێ تۆپەڵە لە ئاسماندا دەبنە هۆی ئەم دیاردانە، نەك فریشتەکان، بیرۆکەی دیکارت ئەوەندە گرنگی پێنادرێت.

لە ئەستێرەناسیدا هەر وەك زۆربەی مەسەلەکانی تر، دیکارت سەردەمێکی کورت ماوەو بێ هاوتا بوو لە بیرۆکەی مرۆیی. شرۆڤەی نوێ کە زەینی وردبینترین بیرمەندە زانستی و فەلسەفیەکانی ئەو سەردەمە بۆ مەسەلە جۆراوجۆرەکانی خستەڕوو، لە زۆربەی بوارەکاندا هەم لۆژیکی و هەم شیاوی تێگەیشتن بوو. هەروەها زۆربەی ئەم شرۆڤانە لە سەر بنەمای ژیری بوو، تێگەیشتنیان سادەیە، بەو مەبەستە دەخرانەڕوو کە رێگایان بۆ بیرکردنەوە لەبارەی ئاڵۆزترین نهێنیەکانی جیهان دەربخەن. ئەگەری نیە کە مرۆڤایەتی بۆ جارێکی تر لەم سەردەمەدا، دۆخێنی وا ئەزموون بکات. لەو سەردەمە بە دواوە، تێگەیشتنی راستیەکان رۆژ بە دوای رۆژ دژوارتر بووەتەوە، جیا لەو بوارە پسپۆڕانە سنوردارانە کە کەسەکە توانایی تێگەیشتنی ئەوانەی هەبوایە. لەو سەردەمە تا ئێستا زانیاری زیاتر لەبارەی مەسەلە سنوردارەکان دۆزیوەتەوە.

دیکارت پاش دەربڕینی رێسای کارکردنی زەین، سەرنجی خۆی بۆ جیهانی دەرەکی ئاراستە کردووە. لەمڕووەوە لە ماوەی سێ ساڵدا "نامیلکەیەکی لەبارەی کەون" نووسی. ئەم نامیلکەیە بیرۆکەکەی لە خۆ گرتبوو وەك: مەسەلە زانستیە جۆراوجۆر و بەربلاوەکان وەك بەردی ئاسمانی، ئاسینی رووناکیەکان و هەندەسە. دیکارت بە مەبەستی بەدواداچوونی خوێندنەوەکانی خۆی لە بواری شیکاری جەستەیی بڕیاری دا سەردانی شوێنی سەربڕینی مەڕو

ماڵاتی ناوچەکەی خۆیان بکات. نموونەی جۆراوجۆری ئەندامی ئاژەڵی لە ژێر کۆتەکەی دەشاردەوە تا بیباتەوە ماڵە تاقیکردنەوەو شیکاری لە سەر بکات لە بەر ئەوە خەڵك لە ڕێگا بە دەستیەوە نەیبینن. لە دەرەنجامی ئەم خوێندنەوانەدا بوو کە دیکارت زانستی کۆرپەلەناسی بنیات نا. چیرۆکێك دەگێڕنەوە لە دیکارت کە ڕۆژێکیان لە شوێنی سەربڕینی مەڕوماڵاتی گەڕەکەکەیاندا گەنجێکی هەیکەلی دەبینێت کە خەریکە نەخشەیەك لە سەر پێستی "گا"یەك کە سەر بڕاوە دەنەخشێنێت. دیکارت لە گەنجەکە دەپرسێت بۆچی مەسەلەیەکی وای هەڵبژاردووە، ئەویش وەڵام دەداتەوە، "فەلسەفەکەی تۆ ڕۆح لە لە بەر مرۆڤ دەبات، من لە نیگارکێشانەکانمدا ئەوە دەردەخەم، تەنانەت بۆ ئاژەڵە مردووەکان." دەڵێن ئەم وێنەکێشە گەنجە هەمان "رامبراند"ە.

پاش سێ ساڵ هەوڵدانی چڕوپڕ، دیکارت بڕیاری دا بەڵگەی سەرەکی "نامیلکەیەك لەبارەی کەون" بۆ باوکی مرسان بنێرێت تا لە پاریس بە چاپی بگەیەنێت، بەڵام لەناکاو هەواڵێکی چاوەڕەوان نەکراو و سەیری لە ڕۆما پێی گەیشت. گالیلۆ تاوانی محاربەی بە سەردا سەپێنرابوو، ڕاکێشی دادگای پشکنینی بیروڕا کرابوو، ناچاریان کردبوو سوێند بخوات کە چالاکییە زانستیەکانی خۆی وەلا بنێتو نەفرینی لێبکات. ئەم سوێندە ناچارییە زیاتر بە هۆی بڕواهێنانی بە بۆچوونەکانی "کۆپەرنیك" بوو کە لە سەر ئەو بنەمایە زەوی بە دەوری خۆر دەسوڕێتەوە. دیکارت خێرا داوای لە

بیکمان ـ ی هاوڕێی کرد بەڵگەیەك لە بەرهەمەکەی گالیلۆی پێبدات، بەوپەڕی نیگەرانیەوە تێگەیشت زۆربەی ئەو دەرەنجامانەی کە گالیلۆ بە دەستی هێناوە، هاوشێوەی دەرەنجامەکانی خۆیەتی. دیکارت بە بێ ئەوە لەمبارەیەوە لەگەڵ کەسێك قسە بکات، "نامیلکەی لەبارەی کەون"ی وەلاناو زەینی خۆی سەرقاڵی هەندێ مەسەلە کرد کە کەمتر کێشەی بۆ ساز دەکرد. (نامیلکەی لەبارەی کەون، تا چەندین ساڵ پاش مەرگی دیکارت بلاو نەبووەوە، لەو کاتەدا تەنها بەشێکی بلاو بووەوە.)

ژیانی دیکارت ئاوێتەیەك بوو لە ناکۆکییە جۆراوجۆرەکان. حەزی بوو لەوپەڕی ئاسوودەیی و تەنهاییدا بژیت، بەلام هەر ئەم تەنهاییەش وای لێدەکرد کە بەردەوام لە گەشت و سەفەردا بێت. وەك بیرمەندێکی ئازاو نوێگەرا سوێندی خواردبوو تا ئەو رادەیە توانای هەیە بە دوای بیرۆکانی خۆیدا بڕوات، لە هەمان کاتدا وەك مرۆڤێك سوێندی خواردبوو پەیڕەوی یاسای وڵاتەکەی بکات، وەفادار بمێنێتەوە لە سەر ئاینی باب و باپیرانی، لە ڕەوتی ژیرانەترین مرۆڤەکان کە دەیناسێت پەیڕەوەی بکات. بڕوای وابوو ئەو شتانەی لە "نامیلکەیەك لەبارەی کەون"دا نووسراوە راستە، بەلام لە هەمان کاتدا باوەڕی تەواوی بە خواوەندی کلێسا هەبوو. دیکارت بە ترسنۆکبوون تاوانبار دەکەن و دەڵێن بە شاراوەیی لە ئاین لایداوە، سەرەڕای بیرکردنەوەی قووڵی زۆر تەنانەت لەبارەی بوونی خۆی زانیاری تەواوی نەبوو، بەلام هیچ یەك لەم

تاوانبارکردنانە شیاوی بەرگریکردن نیە. رەنگە دیکارت لە ریزی قارەمانەکاندا نەبووبێت، بەڵام ئەمەش بە واتای ناخی ئەو نیە. بەوە رازی بوو کە کڵێسا دەتوانێ بە پارێزگاریکردن لە بیروبۆچوونی مامۆستابوونی خۆی لەگەڵ بیرکردنەوە نوێیەکانیدا سازگار بێت، ناسینی بەرامبەر بە خۆی پاش سوقرات، لە هەر فەیلەسوفێکی تر قووڵتر بوو، هەرچەند چەندین خاڵی نادیار لەم ناسینەدا بەرچاو دەکەوت. سەرەڕای ئەمەش دەتوانین گرنگترین ناکۆکی لە خودی فەلسەفەی دیکارت دا بدۆزینەوە. دیکارت جیهانی لە دوو جۆر بنەمادا بە پێکهاتە دەزانی:

١- *زەین.*

٢- *مادە.*

بنەما ئاراستەی نیەو دابەش ناکرێت. لە بەرامبەر ئەوەشدا مادە ئاراستەی هەیەو دابەش دەکرێتو لە یاسای فیزیا پەیرەوی دەکات. بە واتایەکی تر زەینی نا مادی - مان لە جەستەیەکی میکانیکی دایە، بەڵام زەین بە چ شێوەیەك کە ئاراستەی نیە، دەتوانێ لەگەڵ شتۆمەکێکدا کە تەنها توانای ئەوەی هەیە پەیڕەوی لە یاسای زانستی میکانیکی بکات، پەیوەندی بکات؟ دیکارت هەرگیز وەڵامێکی بۆ ئەم پرسیارە نەدۆزیەوە- ئەو پرسیارەی کە بە شێوەیەکی سەیر کاردانەوەی ناکۆکی دەروونناسانەی خۆیەتی کە ژیانی رۆژانە دەشڵەژاند، بەڵام وەك جاری جاران هەوڵیدا ئەم پرسیارە وەڵام نەداتەوە. بە گوێرەی

بیرۆکەی دیکارت، شوێنی پەیوەندیو کاریگەری بەرامبەر زەینو جەستە لە بەشی دواوەی مێشکدایە (بەشێکی سەیرو سەمەرە لە نزیك ریشەی مێشکدایەو رۆڵی بەرچاوی تا ئەمرۆ نەدۆزراوەتەوە). بە داخەوە دیکارت لێرەدا لە باسە سەرەکیەکە لایداوە. پرسیاری سەرەکیمان ئەوە نیە کە زەینو جەستە لە چ شوێنێکدا یەك دەگرن، بەڵکو پرسیار لەوەدایە کە ئەم دوانە بە چ "شێوازێك" پێکەوە پەیوەندی دەکەن.

لەم قۆناخە لە ژیانی دیکارت، رووداوێکی سۆزداری بۆی روودەدا کە ئەو نموونەیە لە ژیانیدا زۆر دەگمەنە. لەگەڵ کچێك کە ناوی "هێلین" بوو، پەیوەندی دروست کرد، بە ئەگەری زۆر دەڵێن کە خزمەتکاری خۆی بووە. ئەنجامی ئەم پەیوەندییە کچێکە کە ناوی دەنێن "فرانسین". پاش لەدایکبوونی فرانسین، هێلین لەگەڵ فرانسین دا لە نزیك ماڵی دیکارت پێکەوە دەژینو بە بەردەوامی دیکارت دەیانبینێت. دیکارت لە لای خەڵكو لە بەر چاوی خەڵك، فرانسین بە خوشکەزای خۆی دەناسێنێت.

بە گوێرەی ئەو بەڵگە کەمانەی کە ماونەتەوە، بە دژوار دەتوانین جۆری پەیوەندی دیکارت لەگەڵ هێلین شیبکەینەوە یان بیگێڕینەوە، بەڵام دەتوانین هەندێ شت لەمبارەیەوە شیمانە بکەین. هێلین- ی داماو چۆن دەیتوانی سەرنجی ئەم نەجیب زادە ساردوسڕە بۆ لای خۆی رابکێشێت؟ لە سەیرکردنە

ساردوسڕەکانی دیکارت کە چاوی چووبووە چاڵ. ئەم ژنە دەیتوانی چ چێژێکی لێوەربگرێت؟

ڕەنگە هێلین بۆ سەرنجڕاکێشانی دیکارت ئەوەندە سەرکەوتوو نەبوو، بەلاّم بە دڵنیاییەوە فرانسین لەم بوارەدا سەرکەوتنی زیاتری بە دەست دێنا. کچۆڵەکە بە گوێرەی ناخی منداڵانەی خۆی دەستی بۆ لای باوکی رادەکێشاو ئەویش وەلاّمی خۆشەویستی کچۆڵەکەی دەدایەوە. ڕەنگە دیکارت بە بینینی کچۆڵەکە، بیری منداڵی خۆی دەکەوتەوە کە بە تەنها مابووەوەو هیچ کەسێك جگە لە پەرەستیارە پیرەکەی چاودێری لێنەدەکرد. هەرچەند دیکارت سەرەتا هەوڵیدەدا فرانسین وەك خوشکەزای خۆی بە خەڵکی بناسێنێت، بەلاّم ئەوەندەی نەخایاند گرێدراوی کچۆڵەکەی خۆی بوو. ئەم ئەزموونە سۆزدارییە لە ژیانی دیکارتدا بێ هاوتا بوو.

لەم سەردەمەدا دیکارت نامیلکەیەکی نووسی بە ناوی "وتار سەبارەت بە شێواز" کە تا ئەمڕۆش یەکێکە لە داهێنەرترین بەرهەمەکانی. سەیر لەوەدایە کە ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم کتێبە هەندێ بەش لە "نامیلکەیەك لەبارەی کەون" پێکیدەهێنا کە وەك بەشێك کە زۆر مەترسی لە سەر نیە گوڵچین دەکرا. بەشێکی زۆری ئەم بابەتە ئەوانەن کە روخساری بیرکاری دەگۆڕن و ئاڵوگۆڕی زۆر لە زانستدا پێکدێنن. لەم بەرهەمەدا دیکارت بنەمای هەندەسەی شیکاری بنیات نا و هەوڵیدا هۆی دەرکەوتنی پەلکەزێڕینە شرۆڤە بکات، هەروەها دیکارت هەوڵیدا تا بیرۆکەی زانستی و ژیرانە بۆ

شـرۆڤەی بـارودۆخی کـەش‌و هـەوا بخاتـەڕوو کـە دەرەنجـام وەك بیرۆکە نوێیەکانی کەش‌وهەواناسـی کەوتـە بەر شـاڵاوی ئـاڵوگۆڕی پێشبینی نەکراو و نارێسای ئەم دیاردەیە.

بەڵام بێگومان باشترین بەشی "وتار لەبارەی شێواز" تا رادەیەك پێــشەکییەکی کورتـــە. ئـــەم پێـــشەکییە هێڵـــی ســـەرەکی بیرکردنەوەکانی کە رووداوە فەلسەفیەکان دەگۆڕێت، وێنا دەکات. لـەم پێشەکێیەدا دیکارت لـە جووڵەیـەکی بنـەڕەتی لـە نەریتـەکان دوور دەکەوێتـــەوە، ئـــەم بیرکردنەوانـــە بـــە شـــێوەیەکی شـــیاوی تێگەیشتن‌و شیاوی خوێندن دەخرێنەڕوو.

بە چ شێوەیەك دەکرێ روانگە قووڵ‌و خوڵقێنـەرە فەلسەفیەکان کـە تـا ئـەو رادەیـە روون‌و راشـکاو بـەیان دەکرێـت کـە هـەموو کـەس بتوانن لێی تێبگەن؟ ئەم کێشەیە نەك هەر من، بەڵکو بۆ چەندین جـــار ئێوەشـــی تووشـــی کێـــشە کـــردووە، بـــەهێزترین بلیمەتـــە فەلـــسەفیەکانی جیهـــان تووشـــی ئـــەوە بـــوون. ئـــەفلاتون بـــۆ تێکشکاندنی ئەم بەربەستە، فەلسەفەکەی خۆی بە شێوەی وتووێژ بـەیان بکرێـت. نیـچە پێیوابـوو بـە نووسـینی درەوشـاوەترین‌و ناسکترین‌و بەهێزترین نووسین کە لە زمانی ئەڵمانیدا نووسراوە، ئـەم مەسـەلەیە چارەسـەر کـردووە، بـەڵام ئـەم خـۆ بەزلزانیـە لـە کۆتاییـدا بـەرەو تێکـچوونی دەروونیـی بـرد. "ویتگێنیـشتاین" هەوڵیدا ئەم مەسەلەیە بە لەبەرچاوگرتنی خوێنەری نووسینەکانی لە سەردەمی تەلەفزیۆندا چارەسەر بکات‌و بیرۆکەکانی خۆی بە

شێوەی رستە لە دوو سێ دێڕدا دەربڕێت، بەڵام ئەم شێوازە دەرگایەکی ئاوەڵا نەبوو بۆ شیکردنەوەو پێوانەی وانە فەلسەفیەکان. شێوازی دیکارت بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە لە هەموو شتێك سادەترو روونتر بوو. لە نووسینێکی دا کە هاوشێوەی ژیاننامە بوو، شرۆڤەی کرد کە بە چ شێوەیەك بیر دەکاتەوەو لەم دەرەنجامەدا چ بیرۆکەی جۆراوجۆرێك لە زەینێکی گەورەدا بیرۆکەی رەسەنی فەلسەفی پێکدێت. دیکارت بە شێوەیەك رەوتی بیرۆکە فەلسەفیەکانی خۆی بە باشی شیدەکاتەوە کە خوێنەر هەڵدەخەڵەتێنێت و پێیوایە ئەم کارە زۆر سادەیەو ئەو شێوازەی بەیانی دەکات لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەکانیدا ئەوەندە جیاواز نیە. خوێنەرە فەلسەفیەکانی خۆی هەنگاو بە هەنگاو بە شێوەیەکی ژیرانە بەرەو دەرەنجامێك کە مەبەستیەتی راکێش دەکات.

دیکارت دەبڕینی بیرۆراکانی بە گەڕانەوە بۆ وڵاتی "باواریا" کە داپۆشراوە لە بەفر دەست پێدەکات. "زستان دەستی پێکردو من خۆمم لە شوێنێك بینیەوە کە هیچ شتێك سەرنجی رانەدەکێشام. لەو سەردەمەدا من دوور بوون لە هەر جۆرە نیگەرانی و شڵەژان و ورووژاوەیەك، لەمڕووەوە بە درێژایی رۆژ لە ئاگردانەکەدا ژیانم بە سەر دەبردو دەمتوانی لەگەڵ بیرۆکەکانمدا بە تەنها بژیم. پاشان بە نووسینێکی لە سەرخۆ شرۆڤە دەکات بە چ شێوەیەك و بە کەڵك وەرگرتن لە شێوازی ئامانجدار، باوەڕمان بەرامبەر بە هەموو

پێکهاتەکانی جیهان تێکچوو. هیچ شتێك بە شێوەی گشتی و تەواو و دڵنیاکەرەوە نامێنێتەوە. هەموو جیهان، چ تاکەکەسیمان، تەنانەت بنەمای بوونمان تەنها خەونێکەو بەس. هیچ ڕێگایەك بوونی نیە بۆ بەدەستهێنانی باوەڕێك. تەنها دەتوانین باوەڕ بە یەك شت بکەین. گرنگ نیە تا چ رادەیەك لەبارەی ئەم بیرکردنەوەیە کە لە مێشکمدا پەروەردەی دەکەم بە لاڕێدا چووم، تەنها راستیەك بوونی هەیە کە حاشای لێناکرێت. (من بیر دەکەمەوە). هەر ئەم راستیە بە تەنهایی دەتوانێ بوونی من بسلەمێنێت. بەناوبانگترین دەستەواژەی مێژووی فەلسەفە کە تایبەت بە دیکارتە بەمشێوەیە دێتە ئارا: "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم".

پاش سەلماندنی ئەم خاڵە دڵنیاکەرەوەیە، دیسان دیکارت هەموو ئەو راستیانەی کە پێشتر لە راستو دروستیان گومانی هەبوو. لە سەر بنەمای ئەم خاڵانە دیسانەوە بنیاتی نا. جیهانی راستیەکانی بیرکاری، زستانی داپۆشراو لە بەفری باواریا، هەموو ئەم شتانە بە باوەڕێکی ساردوسڕ دەگەڕێنەوە، بەڵام ئەمجارەیان پاش تێپەڕاندنی سەردەمی تاراوگەی خۆی بۆ وڵاتی شك و گومان، زیاتر لە هەر سەردەمێکی تر شك و گومان هەڵناگرن، چونکە لە سەر بنەمای راستیەك کە شكو گومان هەڵناگرن بنیات نراوە.

دیکارت لەم نامیلکەیەدا ئازایەتی کردووەو لەبارەی هەموو جیهان شكو گومانی هەبووە، هەروەها بۆ نووسینی نامیلکەکەی زمانی فەرەنسی هەڵبژارد تا خوێنەرێکی زۆر بۆ لای خۆی رابکێشێت.

حەزی نەبوو کلێسای لێ بڕەنجێت، هیوادار بوو بە سەرنجڕاکێشانی کەسانێك بۆ لای ئەم زانستە رابکێشێت و ئارەزوومەندیان بکات کە بەم ئامانجە بگەن. لەوپەڕی سەرسوڕماندا ئەم مەبەستە سەری گرت. خەڵك خێرا نووسەری نامیلکەی "وتارێك سەبارەت بە شێواز"یان ناسی، بەڵام سەرەتا زیاتر گرنگیان بە بیرۆکەی بیرکاری و زانستی پیشان دەدا. بیرکاریزانەکان سەرەتا سەرنجیان رادەکێشرا و پاشان تووڕە دەبوون.

بە بۆچوونی زۆربەمان خاڵێکی سەرەکی لەبارەی بیرکاری ئەوەیە کە مەبەستەکانی بیرکاری یان راستن یان ناڕاست. دەرەنجامێکی وا سادەئاسا بە خێرایی کەسەکان لە دۆخی بیرکاری لادەدات. کاتێك بگەینە ئاستی بلیمەت و گەورەکانی بیرکاری، دابەشکردنی بەرچاوی بیرمەندانەتر لە خۆ دەگرێت. هەرچەند ئەم دەرەنجامە رووبەڕووی راستیەکی حاشاهەڵنەگری زیاتر ببێتەوە، دژبەرەکی زیاد دەبێتەوە. پاش خوێندنەوەی بیرۆکەی بیرکاری نوێی دیکارت و دەست نیشانکردنی خولقاندنی قووڵ، هەموو بیرکاریزانە گەورەکانی ئەو سەردەمە، رەخنەیان بەرامبەر بە دیکارت بەرز کردەوە: پاسکاڵ، ئینسێن و فرما و ... هتد. بەرەبەرەکانی بیرکردنەوەیان لەوپەڕی بیرکردنەوەی مرۆڤەکاندا بوو. ئەو کەسانەی لەم نێوانەدا بیروڕایەکی تریان هەبوو، ئەگەری هەیە چیرۆکی کۆنی دوایین چیرۆکی "فرما" بە شتێکی بەسوود و

فێرکاری دابنێن. لە سەر ئەم مەسەلەیە، هیچ ژمارەیەکی راست لە سەرووی ئەم شتەوە بوونی نیە.

سەبارەت بەم هاوکێشەیە:

$$x^n + y^n = z^n$$

"فرما" پێش مردنی خۆی لە پەراوێزی ئەم هاوکێشەیە نووسی: "من شێوازێکی زۆر باشم بۆ ئەم مەسەلەیە دۆزیەوە، بەلاّم ئەم لاپەڕەیە بەش ناکات تا شتەکانمی لێ بنووسم." سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵدانە بەردەوامە، بلیمەت ترین بیرکاریزانانی سێ سەدەی رابردوو و هیچ کەس تا ئێستا نەیتوانی راستو ناڕاستبوونی دوایین هاوکێشەی "فرما" بسەلمێنێت. هەندێ کەس پێیوایە کە ئەم مەسەلەیە ئەگەری هەیە راست نەبێت، بەلاّم هەندێ کەسی تر بڕوایان بە راستو دروستی ئەو هاوکێشەیە هەیە. هەندێ کەس بڕوایان وایە کە لە راستیدا "فرما" قسەکەی راست نیە، تەنانەت هەندێ کەسی تر دەڵێن ئەو ئازایەتیەی تیا نەبووە ئەوە بسەلمێنێت. بیرکاری بە دڵنیابوون دەست پێدەکاتو لێرەدا کۆتایی پێدێت، بەلاّم فەلسەفە هەر لێرەوە دەست پێدەکاتو لێرەشەوە کۆتایی پێدێت. کاتێك دەڵێن کەسێك بیرۆکەی فەلسەفی هەیە، دەتوانین بڵێن کە ئەو کەسە فەیلوسوف نیە. دیکارت خێرا ئەو مەسەلەیە دۆزیەوە. پاش بیرکاریزانەکان، سەرەی فەیلەسوفەکان هات تا بێنە گۆڕەپانی بیرکردنەوە. هەرگیز دیکارت

لەگەڵ کڵێسادا رووبەڕووی کێشە نەبووەوە. دیکارت شانسێکی باشی هێنا کە کڵێسا لێی نەرەنجێت، بەلام بە خۆشییەوە هاوڕێکانی لە هەموو لایەك لاینگری و بەرگرییان لێدەکرد. باشترین شانسی دیکارت ئەوە بوو کە لە هۆڵەندا دەژیا و لەوێ گەشتی دەکرد.

لە ساڵی (١٦٣٨) بۆ جاری پانزەهەم لە کاتی نیشتەجێبوونی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی هۆڵەندا ماڵی گۆڕیو ئەمجارەیان لە شاری "ئامرەسفوت" نیشتەجێ بوو لە لای شاری "ئۆتەرخێت" کە زانکۆی لێبوو. لەم کاتەدا کچەکەی تەمەنی پێنج ساڵ بوو، دیکارت دەیویست بیبات بۆ فەرەنسا تا بە باشی پەروەردەی بکات، بەلام لەناکاو "فرانسین" نەخۆش کەوتو مرد. ورەی دیکارت رووخا. ئەمە زەربەیەك بوو کە بە درێژایی تەمەنی بینیبووی، "ئادرین بایە" نووسەری ژیاننامەی دیکارت دەڵێت: "دیکارت بە شێوەیەك بۆ مردنی کچەکەی گریا کە پیشانیدا خەفەتی ئێستا دەتوانێ بیرکردنەوەی هەتاهەتایی لە زەینی مرۆڤدا نەهێڵێت."

ئەم قەیرانە کاتێك روویدا کە دیکارت لە کاتی تەواوکردنی نامیلکەی "بیرکردنەوە بە قووڵی = meditation" بوو. ئەم بەرهەمە بە شاکاری دیکارت دادەنرێت. هەرچەند نامیلکەی "بیرکردنەوە بە قووڵی"یەکەی دیکارت سەرەتا ئەوەندە بە قەد "وتارێك لەبارەی شێواز" سەرنجڕاکێش نەبوو، بەلام هەر ئەو

ناسکیەی تێدایەو زمانەکەی نموونەیەکی تەواوە لە جۆری دەربڕینی بیرۆکە سەربەخۆکان. دیکارت بەوپەڕی ئازایەتیەوە دەیوت لە بەر ئەوە نامیلکەی "بیرکردنەوە بە قووڵی"ی نووسیوە کە خوێندنەوەی بیرۆکە سەربەخۆکان بۆ خاتوونەکان ورووژاوە بکات، بەڵام دیکارت ئەمجارەیان خۆپاریزی نەکردو یەکەم بەڵگەی نامیلکەکەی بۆ باوکی "مرسان" بۆ پاریس نارد تا سەیری بکات‌و "بۆچوونی بلیمەتەکان" لەوبارەیەوە بزانێت. دیکارت پێخۆش بوو بیرمەندانی بەرجەستەو هەروەها بۆچوونی "یەسوع"یەکان لەبارەی نامیلکە نوێیە فلەسەفیەکەی بزانێت کە شرۆڤەیەکی بیرکردنەوەی لە خۆ گرتووە کە پێشتر لە "وتارێك لەبارەی شێواز" خستبوویەڕوو. لە نامیلکەی "بیرکردنەوە بە قووڵی"دا دیکارت بەرنامەیەکی گشتگیرتری بۆ گومان خستەڕوو. بەمشێوە بیری دەکردەوە کە هەموو جیهان تەنانەت راستیە زانستیەکانی هەندەسەو پاڵتۆیەکی زستانی کە لە بەری کردووەو لە بەر ئاگردان دانیشتووە، دەرەنجامی بیرکردنەوەی بوونەوەرێکە کە نساخی خراپ‌و نادیارە کە دەیەوێت هەڵبخەڵەتێنێت. دەروونناسەکان بە دڵنیاییەکی تەواو رایانگەیاند کە ئەم کەسایەتیە نێگەتیڤە هەر ئەو دادوەرەیە کە ناوی "ژواکیم دیکارت"ە. بۆ جارێکی تر دیسان زەینی گوماناوی دیکارت دەگەڕێتەوە بۆ هەمان بنەمای سەرەکی حاشاهەڵنەگری پێشۆ، لە سەر ئەم بنەما دڵنیاکەرەوەیە، سەر لە نوێ هەموو جیهان بنیات

دەنێتــەوە. تــا ئــەو رادەیــە بــیری لێدەکاتــەوە کــە بــوونی خــوا دەسەلمێنێت تا رەنگە کلێسای دڵنیا کردبێتەوە، ئەو هۆکارانە کە بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـە کـار دێـن، چـوار سـەدەی پێـشۆتر لـە لایـەن "سەنت ئانسلیم"و "سەنت ئاکۆیناس" خراوەتەڕوو.

هەرچـەند دەرەنجـامی گومـانی دیکـارتی بـە واتـا وشـەییەکەی لـە لایـەن دیکارتـەوە نـەخوڵقا، بـەلام لـەو سـەردەمەدا بـە تـەواوی بـە خوڵقانـدنی ئـەو دەژمێـردرا. "سـەنت ئاگۆسـتین" مـاوەی دوانـزە سـەدە پێش دیکـارت، شێوەو دەرەنجـامی هاوشـێوەی خـستەڕوو، بەلام چونکە دەستی رۆڵی سەرەکی نـەبوو لەو بیرکردنەوەیەدا، بـە گـشتی لـە بـیر کـرا، بـەلام سـەیرە ماوەیـەك پـێش خـودی دیـکـارت فەیلەسوفێکی پرتـەقالی بە نـاوی "فرانسیسکو سانچز" هـەر ئـەو بەرنامـە گومانـاوییـە بـەربلاوەی بـۆ نامیلکـە سەیروسـەمەرەکەی خـۆی بـە خـەڵکی ناسـاند کـە نـاوی "بۆچـی نـاکرێ هـەموو شـتێك بـزانین". ئـەم نامیلکەیـە لـە سـاڵی (١٥٨١)ی ز بـلاو کرایـەوە. "سـانچز" شانـسێکی باشـی هـەبوو کـە لـەو کاتـەدا سـەرنجی زۆر کەسـی بـۆ لای خـۆی رانەکێـشا. ئـەگینا لـە بـری ئەوە لـە تەمـەنی هەفتاو سێ سـاڵی دا لـە شـاری "تولـوز" بە ئاسـوودەییەکی تـەواو ژیانی تـەواو بکـات، ئەگـەری هـەبوو لـە تەمـەنی سـی و یـەك ساڵیدا وەك قارەمانێکی گەورە لە رێگای فەلسەفەدا لەسێدارە بدرێت.

دیکـارت ئـارەزووی قارەمـانێتی لـە مێـشکدا نـەبوو، بـەلام هـەوڵی زۆری نەدا بۆ ئەوەی بە نەناسـراوی نەمێنێتـەوە. هەرچـەند هـەموو

تایبەتمەندییەکی پێویستی بۆ بە نەناسراوی مانەوەی تێدا هەبوو. تەمەڵییەکەی بۆ ئەم کارە بەس بوو. دیکارت دەیویست دەنگی بە گوێی هەموو کەسێك بگات، بەلام لە هەمان کاتدا حەزی بوو بیرکردنەوەکانی لە مێشکی خەڵکدا بمێنێتەوە. بە تەواوی بەوە رازی ببوو کە راست دەکات؛ بەلام نەیدەویست لەمبارەیەوە کڵێسا رازی بکات. بۆ ئەم مەبەستەش باوکی "مرسان" بە پێی داواکارییەکانی دیکارت بەڵگە سەرەکیەکانی نامیلکەی "بیرکردنەوە بە قووڵی" بۆ کەسایەتیە ناودارەکانی بیرمەندی ئەوروپا روانە کرد، ئەو کەسانە بریتی بوون لە: گاسەندی، هابز و ئارنۆڵد. ئەوانەش بە چەندین رەخنە بەرامبەر بە بیرۆکەکانی دیکارت وەلامی ئەم کارەیان دایەوە. ئەم رەخنانە بووە هۆی دڵ ئێشانی دیکارت. پێشنیاری پێکرا ئەم رەخنانە لە کۆتایی نامیلکەکەی دابنێت و چاپی بکات، لەمڕووەوە دوایین بەڵگەی "بیرکردنەوە بە قووڵی" بە چاپ گەیەنرا کە بریتی بوو لە: رەخنەگرتن بۆ پێوانەکانی دیکارت، هەروەها وەلامدانەوەی دیکارت بەرامبەر ئەم رەخنانە.

بەلام بەوجۆرە کە پێشبینی دەکرێت، بلاوکردنەوەی نامیلکەی "بیرکردنەوە بە قووڵی"یەکەی دیکارت هەرایەکی زۆری نایەوە. (یەسوع)یەکان بە باشی زانیان کە گومانی دیکارتی سەبارەت بە مەسەلەی "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم" بە واتای کۆتایی فەلسەفەی مامۆستایەتی (سکۆلاستیك) و فێرکارییەکانی

ئاکۆیناس– ە. بەڵام بە هۆی بەختی خراپی رۆژگار ئەمجارەیان گفتوگۆ لەوبارە بەرەو هۆڵەندا پەلی کێشا. بەرپرسی زانکۆی "ئوتەرخێت"، دیکارتی بەوە تاوانبار کرد کە حاشا لە خوا دەکات. بە راشکاوی دیکارتی بەوە تاوانبار کرد وەك کابرایەك کە ناوی "وانینی" بوو پێشتر هەر ئەم کارەی کردووە کە هیچ هۆکارێکی بۆ سەلماندنی ئەم کارە نەبووە، ئێستاش دیکارت بۆ سەلماندنی ئەم کارە هیچ هۆکارێکی نیە. "وانینی" لە ساڵی (١٦١٩)ی ز لە شاری "تولوز" سوتێنرا، رەنگە هەر لەو کاتەشدا فەیلوسوفێکی خەڵکی وڵاتی پورتەگال کە پیر و بێ ناونیشان بووە لە ناو خەڵکەکەدا راوەستابێت و سەیری ئەوانی کردبێت و لە ژێر لێوەوە وتبێتی: "ئەگەر خوا رەحمی نەکردبا، هەر ئەم بەڵایەش بە سەر مندا دەهات." دوای ئەوە کە بەرپرسی زانکۆی ئوتەرخێت بە دەمی هێرشی کردبووە سەر دیکارت. چەندین کەسی ناسراو و بەناوبانگی هۆڵەندی لەگەڵیدا هێرشیان کردە سەر دیکارت و بەوە تاوانباریان کرد کە دژی خوایە. لەو سەردەمەدا حاشاکردن لە خوا تاوانێکی گەورە بوو، بەڵام حاشا لە خوا کردن بە تاوانێکی زۆر خراپ دەژمێردرا. لە کۆتاییدا بالۆیزی فەرەنسا بە سوودی دیکارت دەنگی دا، بە هەر حاڵ بە سوودی دیکارت تەواو بوو، هەرچەند تا ماوەیەك پاش ئەوەی بچوکترین ئاماژەی پوزەتیف و نێگەتیڤ بە ناوی دیکارت لە زانکۆی ئوتەرخێت قەدەغە کرا، بەڵام پاش ماوەیەك بە دوای شکاتی گروپێکی بیرکاریزانی ئەم زانکۆیە

کە ئیتر توانایان نەبوو خولی هەندەسە بکەنەوە، ئەم قەدەغەیە وەلانرا.

لەم کاتەدا دیکارت لە سەرانسەری ئەوروپادا ناسرا و ناوبانگی چووە سەرووی بیرمەندانی تر، بە شێوەیەك كە تەنانەت بنەماڵە پاشایەتیەکانی ئەوروپا بەرهەمەکانی دیکارتیان دەخوێندەوە. کاتێك مەلیکە گەنجەکەی سوید، کریستینا یەکێ لە کتێبەکانی ئەوی خوێندەوە، بە رادەیەك كە كاریگەری لە سەری دانا کە دەعوەتی کرد بۆ کۆشکی خۆی. دیکارت دەیوست بۆ وانەوتنەوەی فەلسەفە بە مەلیکە بڕواتە ستۆکهۆڵم. لەم کاتەدا ماوەی چەندین ساڵ درەنگ لە خەو هەستان و بیرکردنەوە بۆ ئارامی و ئاسایش، وردە وردە كاریگەری نێگەتیڤی خۆی لە سەر دیکارت دانا. هەرچەند تەنها پەنجا و سێ ساڵ بوو، بەلام چوار ساڵ بوو کە شوێن گۆڕکێ نەکردبوو. لەم قۆناخەدا دیکارت، ماڵێکی بچوکی لە "ئاگمۆند- بینەن) کە دەکەوێتە بیست کیلۆمەتری باکووری ئەمەستەردام و نزیك لە کەناری دەریا بۆ نیشتەجێبوونی خۆی هەڵبژارد. ئەو بە دوای بیرکردنەوەکانیدا لە ژورە شەش سووچەکەی خۆی دادەنیشت و سەیری باخچە جوانە کۆنەکەی دەکرد. هەندێجار دیکارت دەچووە پاریس تا بیروڕای خۆی لەگەڵ هاوڕێیە کۆنەکانی وەك گاسەندی، پاسکاڵ، هابز و ئارنۆڵد باس و وتووێژ بکات. بیرکردنەوە لە گەشتێکی درێژخایەن بۆ باکوور و بۆ وڵاتی ورچەکان و نێو بەردو بەستەڵەکەکان، بەو جۆرەی کە خودی

دیکارت باسی لێدەکات، لە روانگەی دیکارت ئەوەندە خۆش نەبوو. بەڵام مەلیکە کریستینا ژنێکی بە ئیرادەو شێلگێر بوو، لە حاڵێکدا تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو، بە تەواوی لە سەر وڵاتی خۆی فەرمانڕەوایی دەکرد. باڵای مەلیکە (١٥٢) سەنتیم بوو، بەڵام شانی پان بوو وەك سەربازێك فێری شتەكان ببوو. دەڵێن بە بێ ئەوەی هیلاك بێت، بۆ ماوەی دە کاتژمێر بە سەر ئەسپەوە هاتووچۆی دەکرد، هەرچەند کە سوارکردنی ئەو ئەسپە سەرسوڕمانی بە سەرەوەیە. کاتێك بوو بە فەرمانڕەوا، سوێندی خوارد کە پایتەختی خۆی بکاتە ستۆکهۆڵم کە بە هۆی ئەوەی دەریاچەی تێدایەو بە باکوور ناوبانگی دەرکردبوو، وەك پاریس وای لێبکات و بیکاتە پاریسی باکووری وڵاتەکەی، بیکاتە ناوەندێکی فەرهەنگی. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵدانەی ستۆکهۆڵم وەك خودی ستۆکهۆڵم مابووەوە. دیکارت بۆ مەلیکە شانسێکی گەورە دەژمێردراو بڕیاری دا بە هەموو نرخێك کە بووە لە دەستی نەدات. مەلیکە بۆ بەهێزکردنی دەعوەتەکەی خۆی لە دیکارت، کەشتیەکی شەڕی لەگەڵ دەریاسالارێك دا بۆ هێنانی دیکارت بەرەو هۆڵەندای نارد، بەڵام دیکارت بۆ رۆیشتنی لە سوید نارەزایەتی دەربڕی، هەرچەند ئەم کارەشی بە ئەدەبەوە ئەنجام دا. نامەیەکی بۆ دەریاسالارەکە نارد کە بە تانەو تەشەرەوە قسەی کردبوو و تێدا نووسیبووی: "مەلیکەی رێزدار زیاتر لە هەر مرۆڤێکی تر روخساری خوا وێنا دەکات." بەڵام داوای لە مەلیکە

کرد کە لێیبورێت بە هۆی "تێگەیشتنی رووناکایی شکۆداری خۆی"

کریستینا، پاش ئەوەی نامەکەی خوێندەوە، بە پتەوی قاچی خۆی بە زەوی دا، ئەو رۆژە دەرباری مەلیکە زۆر ناخۆش بوو – رۆژێکی ناخۆشیان لەوێ تێپەڕ کرد. بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر ئەسپ سواری کردو پاشان کەشتیەکی تری بۆ هۆڵەندا نارد. دیکارت لە باسی زانستی و فەلسەفێ دا گەورەترین بیرمەندە ئەوروپیەکانی شکست دابوو، ناچار بوو ئەمجارەیان شکستەکە قبوڵ بکاتو تەسلیم ببێت. لە ساڵی (١٦٤٩)ی ز سواری کەشتیەك بوو بەرەو ستۆکهۆڵم بەڕێکەوت. مەلیکە کریستینا جەژنێکی زۆر شکۆداری بۆ پێشوازی دیکارت پێکهێنا. پاشان دیکارت دوو وانەی تایبەتی بۆ مەلیکە دانا، بەڵام وادیاربوو لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دیکارت شتێکی زۆری بە دەست نایەت، مەلیکە بەو ئەنجامە گەیشت کە شتێکی زۆر بۆ تێگەیشتنی فەلسەفەکەی دیکارت نیە. دیکارت شەش هەفتەی تەواوی بە دەست بەتاڵی تێپەڕ کرد تا زستانی ساردی سویید خۆی پیشان دا، ئەو ساڵە زستانێك بوو کە شەست ساڵ لەوەوپێش سەرمای وا دەرکەوتبوو. بۆ ماوەی شەش مانگی تەواو شارەکە پڕ لە سەهۆڵ بوو، لە کاتی نیوەڕۆ هەوا پڕ بوو لە هەوری رەشو تارمایی، لە دەرەوەی شار گورگەکان لە ژێر رووناکایی ساردی تیشکی

(ئەستێرەی کاروان کوژە)، یان ئەستێرەی جەمسەری لوورە لووریان دەکرد.

کریستینا نیگەرانی ئەو دۆخە بوو کە توانایی سەرسوڕهێنەری دیکارت لە سەرمای پایتەختەکەیدا بە فیڕۆ بڕوات، بۆیە لێپرسراوییەکی لە ئەستۆی دانا. دیکارت ئەم لێپرسراوییەی بە دوودڵی پەسەند کردو سەرقاڵی ڕێکخستنی چەند هۆنراوەیەك بوو بۆ جەژنێك بە ناوی "لەدایکبوونی ئاشتی"، کە بەڵێن وابوو لە ڕۆژی لەدایکبوونی کریستینا جێبەجێ بکرێت. ئەگەری زۆر هەبووە کە دیکارت شارەزایی لە مۆسیقادا هەبووە چونکە هاوکات لەگەڵ تەواوبوونی ئەم جەژنەدا، داوای لێکرا نمایشێکی کومێدی مۆزیکاڵ لەبارەی دوو شازادە بنووسێت کە پێیوابوو شوانن. بەداخەوە نەمتوانی هیچ جۆرە ئاماژەیەك لە کۆمەڵە نووسینەکانی دیکارت لەمبارەیەوە بدۆزمەوە، هەڵبەت جیا لەم قسەیە کە بە هۆی خەفەتەوە دەریبڕیوە: "لە مانگی ساردە زستانیەکاندا مێشکی مرۆڤ رادەوەستێت."

پاشان لە ناوەڕاستی مانگی جنێوەری، کریستینا بڕیاری دا سەر لە نوێ وانەی فەلسەفە دەست پێبکاتەوە. دیکارت بانگێشت کرایەوەو پێڕاگەیەندرا کە مەلیکە پێیخۆشە لە هەفتەیەکدا سێ جار وانەی فەلسەفە بخوێنێت و هەموو وانەکانی کاتژمێر (٥)ی سەر لەبەیانی دەست پێبکات.

تەنانەت لە ناو سوپاشدا دیکارت هەرگیز پێش کاتژمێر (١١)ی بەیانی لە خەو هەڵنەستابوو. بیرکردنەوەی دیکارت بۆ لە خەوهەستانی لە بەیانیەکی زووی ساردی زستانی وڵاتی ئەسکەندیناڤیا زۆر بە لایەوە دژوار بوو، جیا لەوەش بیری لەوە دەکردەوە سەر لەبەیانی زوو دەبێ وەك هەر فەرەنسیەکی تر بە رواڵەتی خۆی رابگات کە هەموو فەرەنسیەك بە راڕایی بە رواڵەتی خۆیاندا رادەگەن، لەو بەیانییەدا کە لوورە لووری گورگەکان بە گوێدا دێن، پاشان بیرکردنەوە لە سواربوونی گالیسکە لە سەر شەقامەکان کە وەك ئاسن توند ببووەوە– لە سەرمای جەمسەری باکوور کە چڕت پێوە دەدا. لە بەر ئەوە لەو دۆخەی دیکارتی تێدا بوو تێبگەین، ئەوەندە پێویستمان بە هەوڵدانێکی زۆر نیە. لە ماوەی دوو هەفتەدا وەها سەرمایەك چووە لەشیەوە کە لێی کردیە نەخۆشی (سنگە کوژێ). پاش ماوەیەکی تر تووشی وڕینەو (تا) بوو، لە بەرواری (١١) فێبرەوەری (١٦٥٠) گیانی لە دەست دا. یەکێك لە بەرجەستەترین بلیمەتەکانی ئەوروپا بووە قوربانی ئارەزوو و هەواوهەوەسی پاشایانە. دیکارت کاسولیك بوو، نەدەکرا لە وڵاتێکی پروتێستانی وەك سوید بنێژرێت کە هەموو مردووەکانی کاسولیکن. لەوڕووەوە لە گۆڕستانی ئەو منداڵانەدا ناشتیان کە لە ئاو هەڵنەکێشرابوون.

پاش سێزنزە ساڵ لە تێپەڕبوونی مردنی دیکارت، کڵێسای کاسولیك بۆ ڕێزلێنان لە دیکارت یادی بەرز راگرت و هەموو

بەرهەمـەکانی لـە ریـزی بەرهەمـە قەدەغـەکراوەکانی کلێـسا دانـا. لـەمڕووەوە گـەرەنتی کـرد کـە ئـەم بەرهەمانـە بـۆ مـاوەی سـالآنێکی دوور و درێژ لە بەر دەستی خوێنەراندا دەبێت. پاشـان لـە سـەدەی هەڤدەهـەم، تەرمەکـەی بـۆ پـاریس گواسـترایەوەو لـەوێ نێـژرا. لـە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا پێشنیار کـرا کـە دیـسانەوە بنێـژرێت. ئـەم مەسـەلەیە لـە پەرلـەمانی نەتەوەییـدا باسـی لێـوە کـرا کـە لـە گۆڕسـتانی (پـانتیۆن) لـە لای بیرمەنـدانی گـەورەی فەرەنـسا بنێژرێت. ئەم مەسەلەیە لە پەرلەمانی نەتـەوەیی فەرەنسا راپرسـی لە سەر کرا. لـە پێشهاتەیەکی نائاسایدا ئەندامانی پەرلـەمان بە گوێرەی بنەما زانستیەکانیان کرانە دوو بەشەوە:

***گرووپـی یەکـەم/ روانگـەی میکـانیکی دیکارتیـان لـەبارەی جیهـان پەسەند دەکرد.***

***گرووپـی دووەمـەم/ ئـەو کەسـانە بـوون کـە پاڵپـشتیان لـە بیرۆکـە نوێیەکەی "نیوتۆن" دەکرد.***

دیکـارت بـۆ راڤـەکردنی پەیوەندییـەکانی کـەون، بیرۆکـەی گێژەلۆکەکانی هێنابووە ئارا. بە گوێرەی ئەم بیرۆکەیـە: جووڵـەی (گەردیلـە)یـەك کاریگـەری لـە سـەر هـەموو گەردیلـەکانی کـەون دادەنێـت. ئـەم کاریگەریـەش لـە رێگـای کۆمـەڵێك گێژەلۆکـەی کاریگەر جێبـەجێ دەبێت کە هەموو شتێکی لـە کۆمەڵـەی خـۆر و ئەستێرەکان وەرگرتووە، هەروەها ئەو کاریگەریەشـی لـە بچوکترین گەردیلـەی کـەون وەرگرتـووە. هەڵبـەت ئـەم روانگەیـە بـەرەو

سیستمێکی ئاڵۆز دەڕوات و کۆتایی پێدێت کە تەنها بیرکاریزانێك لەوە تێدەگات، بەلام روانگەی دیکارتی ئامارژە بە خاڵێکی گرنگ دەدات بۆ تێپەربوونی لە رێگای ئەندێشەی تەواوی مرۆڤی. بیرۆکەی دیکارت زۆر هاوشێوەیە لەگەڵ زنجیرەکانی DNA و بیرۆکەی "گوریسە پتەوەکان" لەبارەی گەردیلەی بنەڕەتی. هەروەها دیکارت بە دوای هێزێکەوە بوو کە بتوانێ پەیوەندییەکی دوو لایەنە لە نێو زەین و جەستەدا دابین بکات، شتێك هاوشێوەی شەپۆلی رادیۆیی یان ئەلێکتریستە، بە بڕوای بیرمەندێکی نوێ کە ناوی "جۆن دۆ ماندویل" بوو، ئەم مەسەلەیە ئەوەی دەردەخست کە زەینی مرۆڤ تا رادەیەك بە بێ گرینگیدان بە ئامانجەکەی، لە ئاراستەی واتاداری دەست نیشانکراودا دەجوولێتەوە.

کاتێك مەسەلەی جێگۆڕکێی شوێنی ناشتنی دیکارت لە پەرلەمانی نەتەوەیی فەرەنسا خرایە راپرسییەوە، لاینگرانی بیرۆکەی نیوتۆن توانیان دیکارتیەکان شکست بدەن. بیرۆکەی "راکێشان" لەو سەردەمەدا باسی زۆری لێدەکرا، لەمڕووەوە دیکارت رێگای بەرەو گۆڕستانی بیرمەندانی گەورە نەچوو.

جاران کە راستیەکان لە چوارچێوەی ئیلاهیات بە دوایدا دەگەڕان، چووبووە ناو چوارچێوەیەکی دیموکراسی و دیکارت لە هیچ کام لەم دوو شوێنەدا پێگەی نەبوو. ئێستا ئارامگەی دیکارت لە کڵێسای "سەنت جێرمەن دپرە" لە ناوەندی "کارتیە لاتین"ی پاریس دایە.

*پاشکۆی نەوتراو:*

تا پێش دەرکەوتنی دیکارت، فەلسەفە لە خەوێکی قووڵدا بوو. سەردەمی نوێی فەلسەفە بە دیکارت دەست پێدەکات. لەمە بە دواوە رەسەنایەتی تاك‌و شیکردنەوەی هوشیاریی مرۆڤ بۆ مەسەلە بنەڕەتییە فەلسەفیەکان دەگۆڕدرێت. بارودۆخی فەلسەفە تا ماوەیەك لەوەوپێش وەك خۆی مابووەوە. تەنها بە دەرکەوتنی فەلسەفەی شیکاری بوو کە رەسەنایەتی تاك‌و شیکاری هوشیاریی مرۆڤ شوێن خۆی گۆڕی بۆ بنەمای وشە و شیکاری واتاکان. جارێکی تر فەلسەفە چاوەڕێ دەرکەوتنی بیرۆکە دیکارتیەکی ترە کە لە خەو هەڵیبستێنێتەوە.

**نووسینەكانی دیكارت:**

سەردەمانی رابردوو بۆ جاری یەكەم تێگەیشتم كە لە سەردەمی منداڵیدا بیروڕا ناڕاستەكانم وەك بیروڕای راستەقینە وەرمگرتبوو؛ تێگەیشتبووم كە پێكهاتەی بیركردنەوەكانم كە هەمووی لە سەر ئەم بنەما ناڕاستانە پێكهاتبوو تا چ رادەیەك متمانەی پێنەدەكرا. لەمڕووەوە تێگەیشتم ئەگەر بمەوێ لە زانست دا بگەمە دەرەنجامی پتەو و نەمر و سەقامگیر، پێویستە بۆ جارێك خۆم لەو چوارچێوە بیروڕاكانی جاران كە وەرمگرتووە، رزگار بكەم، ئنجا لە بنەمایەكی زۆر تازەوە دەست بە كارەكانم بكەم.

**"بیركردنەوە بە قووڵی"/ یەكەم بیركردنەوە/ یەكەم دێڕەكان.**

زۆربوونی رێژەی یاسا، بەربەستە بۆ جێبەجێ نەكردنی یەكسانی. كاتێك دەتوانین بە سەركەوتوویی فەرمانڕەوایی بە سەر وڵاتدا بكەین كە یاساكان كەم بن و بە باشی جێبەجێ بكرێن، لەمڕووەوە بەم ئەنجامە گەیشتم كە لە بری رێژەی زۆری یاساكان كە

پێکهاتەی لۆژیکن، چوار یاسای لای خوارەوە بۆ مەبەستەکانم بەسە: بە مەرجێك بە پێداگریو شێلگیرانە لە هەموو قۆناخەکاندا بە راشکاوی جێبەجێیان بکەین:

١- ***یاسای یەکەم/*** هەرگیز شتێك پەسەند نەکەم لە حاڵێکدا بە باشی ئاگام لێ نیە، بە واتایەکی تر خۆم دوور بگرم لە هەر جۆرە پێشداوەرییو بیرکردنەوەیەکی پێشوتر. تەنها ئەو کارانە لە زەینی خۆمدا بۆ داوەریکردن جێگیر بکەم کە هیچ گومانێك لەبارەیەوە نیەو روونە بەلامەوە کە جیام کردووەتە بۆ ئەوەی لە مێشکمدا بمێنێتەوە.

٢- ***یاسای دووەم/*** بریتیە لە دابەشکردنی هەر یەك لەو مەسەلانە کە پێویستە دابەشی بکەین بۆ چەندین بەشی بچوکتر کە پێویستە بەوە بگەین بە رێگایەکی گونجاو.

٣- ***یاسای سێهەم/*** یاسای سێهەم ئەوەیە کە بیرۆکەکانم بەرەو ئاراستەیەکی رێكو پێك رێنوێنی بکەم بە شێوەیەك کە دەستپێکەکانم لە سادەترینو ناسراوترین مەسەلەکان جووڵەیان لێبخەم، پاشان هەنگاو بە هەنگاو و وردە وردە بەرەو زانستە ئاڵۆزەکان هەنگاو بنێم، لەم رێگایەدا تەنانەت رێكوپێکی دەخەمە بەر ئەو مەسەلانە کە بە رواڵەت هیچ جۆرە رێکخستنێکیان پێوە دیار نیە.

٤- ***یاسای چوارەم/*** یان دوایین یاسا ئەوەیە هەموو بەشەکانی مەسەلەیەك بە تەواوی پێوانە بکەم و بە هەموو قۆناخەکانیدا بچمەوە تا دڵنیا بم کە هیچ شتێکم لە بیر نەچووەتەوە.

٥-

***"وتارێك لەبارەی شێواز"/ بەشی یەکەم.***

زنجیرەی بەربلاوی پێوانە سادەو ساکارەکان کە هەندەسەزانەکان بە کاری دێنن و بە پاڵپشتی بەوە بە ئاڵۆزترین دەرەنجامەکان دەگەن، ئەوەش وای لێکردم کە هەموو ئەو شتانەی دەتوانن ببنە بنەمای مەسەلەیی بۆ ناسینی مرۆڤ، بە شێوەیەك پێکەوە لە پەیوەندیدان، هەتا کاتێك کە دوور بگرین لە پەسەندکردنی بیروڕای ناڕاست لە بری بیروڕای راستەقینە. هەروەها لە بیرکردنەوەکانماندا رێکخستنی پێویست بۆ تێگەیشتن لە راستیەك لە راستیەکانی تر بپارێزین، هیچ ناسینێك یان زانستێك ناتوانی لەوپەڕی تواناییمانەوە بێت، هەروەها هیچ راستیەك ئەوەندە شاراوە نامێنێتەوە کە نەتوانین نەیدۆزینەوە. هەروەها بۆ دەست نیشانکردنی ئەو مەسەلانەی کە پێویست بوو لەوانەوە دەست پێبکەم، ئەوەندە تووشی کێشە نەبووم چونکە لە سەرەتاوە لە

سەر ئەو بڕوایە بووم کە ئەم مەسەلانە پێویستە سادەترین و ساکارترین ئەو راستیانە بن کە ناسراون.

## "وتارێک لەبارەی شێواز"/ بەشی دووهەم.

چونکە ئارەزووم هەبوو بە تەواوی خۆم تەرخان بکەم بۆ دۆزینەوەی راستیەکان، پێوست بوو لەبارەی هەموو شتێك کە رووبەڕووی دەبوومەوە گومانی تێدا بکەم و بە ناڕاستی دابنێم، تا دەرەنجام ئایا راستیەکەم بۆ دەمێنێتەوە کە بە تەواوی گومانم لێ نەبێت و پەسەندی بکەم. هەروەها چونکە هەستەکانمان هەندێجار هەڵماندەخەڵەتێنێت، بڕیارم دا وا بیر بکەمەمە هیچ شتێك لە راستیدا بەوجۆرە نیە کە هەستەکانمان پیشانمان دەدات. چونکە هەندێك لە ئێمە لە تێگەیشتنەکانماندا تووشی هەڵە دەبین، تەنانەت لە سادەترین مەسەلە هەندەسیەکاندا تووشی هەڵەی لۆژیکی دەبین، من هەموو ئەو تێگەیشتنانەی کە پێشتر بۆ سەلماندنی مەسەلە جۆراوجۆرەکان کەڵکم لێوەگرتووە، بە هەڵەی دادەنێم، بە هەر حاڵ کاتێك بینیم هەر ئەو تێگەیشتنانەی کە لە کاتی هوشیاریدا بە دەستی دێنین، لە کاتی خەویشدا کە بیر لە تێگەیشتنی شتێك ناکەینەوە لە زەینماندا دەچەسپێت، بڕیارم دا وا بیر بکەمەوە ئەو شتانەی تا ئێستا لە زەینم دا چەسپیوە،

تەنها خەونێکەو تەواو، بەڵام خێرا تێگەیشتم لە کاتی پیاچوونەوەی ئەم بیروبۆچوونانەمدا، هەروەها کە هەموو مەسەلەکانم بە هەڵە دادەنا، بە هەر حاڵ زۆر پێویستە کە من واتە خاوەنی بیرکردنەوەکە بوونم هەبووبێت. بەم ئەنجامە گەیشتم کە ئەم راستیە واتە "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم"، ئەوەندە تەواو و دڵنیاکەرەوەیە کە هیچ شك‌و گومانێك تەنانەت لە لایەن ئەو کەسانەی کە زۆر گومان لە شتەکان دەکەن، ناتوانێ ئەو بیرۆکەیەی برووشێنێت. لەورووەوە ئەنجامم وەرگرت کە دەتوانم ئەم راستیە بە بێ ئەوەی بچوکترین گومانی تێدا هەبێت وەك بنەمای سەرەکی فەلسەفەیەك کە دەمەوێ جێبەجێی بکەم، پەسەندی بکەم.

*"وتارێك لەبارەی شێواز" / بەشی چوارەم.*

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان زەین‌و جەستە لە ئارادایە، چونکە جەستە بە گوێرەی ناوەڕۆکی خۆی شیاوی دابەشبوونە، لە حاڵێکدا زەین بە هیچ شێوازێك دابەش ناکرێت– چونکە کاتێك من وێنای زەین دەکەم یان بە واتایەکی باشتر کاتێك خۆم بە تەواوی وەك بوونەوەرێکی بیرمەند وێنا دەکەم، هیچ جۆرە بەشێك لە بوونی خۆمدا دەست نیشان ناکەم‌و بە راشکاوی دەبینم کە بوونەوەرێکی زۆر سادەو تاکم. هەرچەند

وادەردەکەویت کە هەموو زەینم لەگەڵ هەموو جەستەمدا یەکی گرتووە، بەڵام کاتێك قاچێك یان دەستێك یان هەر ئەندامێکی تری جەستەی من ببڕدرێت، هەرگیز هەست بەوە ناکەم کە بەشێك لە زەینم کەم ببێتەوە. جیا لەوەش ناکرێ هیچ کام لە دۆخە زەینیەکان وەك: ئیرادە، تێگەیشتن و وێنا و دۆخی لەم شێوەیە بە بەشی زەین دابنێن، چونکە زەینێکی تاك یان یەکە، ئیرادە دەکات و تێدەگات و وێنا دەکات لە حاڵێکدا مەسەلەکە لە سەر بوونەوەرە مادیەکان یان خاوەن مەودا (شتێك کە چەند لایەنی هەبێت) بە پێچەوانەوەیە. چونکە ناتوانم وێنا بکەم هەر کام لەم بوونەوەرانە دابەش نەکرێت، لەمڕووەوە هەموو ئەم بوونەوەرانە بە شیاوی دابەشکردن دادەنێم.

## "بیرکردنەوە بە قووڵی"/ بیرکردنەوەی شەشەم.

بیرکردنەوە لە نێو خەڵکی جۆراوجۆردا یەکسان ترە لە هەر شتێکی تر، چونکە هەموو خەڵك بە رادەی پێویست پیان وایە ئەو شیاوی ئەو هێزەن، تەنانەت ئەو کەسانەش کە بۆ بەشی خۆیان گلەییان لە شتەکانی تر هەیە، بە دەگمەن بۆ بەدەستهێنانی زاناییەکی زیاتر ئارەزوو پیشان دەدەن. لەمبارەیەوە هەموو مرۆڤەکان بە هەڵەدا نەچوون. وادیارە کە دادوەری راست و توانایی دەست نیشانکردنی راست لە

ناراست– کە بە راستی ئەوە بە تێگەیشتنی راست یان ژیری دابنێین– بە گوێرەی سروشت لە نێو هەموو مرۆڤەکاندا بە شێوەی یەکسان دابەش بووبێت. دەرەنجام جیاوازیمان بەو هۆیەوە نیە کە لە هەبوونی ژیریدا پێکەوە جیاوازین، بەڵکو بە گشتی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هێزی بیرکردنەوەمان بە چەندین ئاراستەی جیاجیادا ئاراستە دەکەین و هەموومان بە شێوەی یەکسان سەرنجی یەك مەسەلەیە نادەین. بوون بە خاوەن یان هەبوونی زەینێکی بەهێز بەس نیە، بەڵکو خاڵی گرنگ ئەوەیە کە فێر بین بە چ شێوەیەك زەینمان لە ئاراستەی باشدا بە کار بێنین. بەهێزترین زەینەکان توانایان هەیە لە ئاراستەی گەورەترین رەوشتە خراپەکان هەنگاو بنێن، هەم بۆ بەدەستهێنانی والاترین رەوشتە باشەکان هەوڵبدەن. ئەو کەسانەی کە بە هێواشی هەنگاو دەنێن بۆ ئەوەی لە رێگایەکی باشەوە برۆن، زیاتر لەو کەسانە پێشکەوتن بە دەست دێنن کە بە پەلەپەل هەوڵدەدەن و لە رێگای پێویست و باش لادەدەن.

***"وتارێك لەبارەی شێواز"/ بەشی یەکەم.***

## ڕۆژژمێری ڕووداوه گرنگه فەلسەفیەکان

| بەروار | ڕووداوی فەلسەفی |
|---|---|
| سەدەی شەشەمی پ. ز | دەسپێکی فەلسەفەی ڕۆژئاوا لەگەڵ بیرۆکەکانی تالێسی مەلەتی. |
| کۆتایی سەدەی شەشەم | مردنی فیساغۆرس. |
| ٣٩٩پ. ز | سوقرات لە ئەسینادا بە مردن تاوانبار دەکرێت. |
| ٣٨٧پ . ز | ئەفلاتون ئەکادیمەکەی خۆی لە ئەسینادا بنیات دەنێت کە بە یەکەمین زانکۆ دەژمێردرێت. |
| ٣٣٥پ. ز | ئەرەستۆ خوێندنگەی لیسەیۆم لە ئەسینادا بنیات دەنێت کە دەبێتە شوێنێك بۆ کێبڕکێ کردنی ئەکادیمەکەی ئەفلاتون. |
| ٣٣٤ پ. ز | ئەمپەراتۆر "کنستانتین" پایتەختی ئەمپەراتۆری ڕۆما بۆ شاری بیزانس دەگوازێتەوە. |
| ٤٠٠ ز | "سەنت ئاگۆستین" کتێبی "دانپیادانانەکان"ی |

| | |
|---|---|
| | خۆی چاپ دەکات. فەلسەفە لە ئیلاهیاتی مەسیحی دا ئاسان دەکرێتەوە. |
| ٤١٠ ز | رووخـــانی ئەمپـــەراتۆریای رۆمـــا بـــە دەســـتی بەربەرەکان. |
| ٥٢٩ ز | داخـــستنی ئەکادیمـــەی ئەســـینا بـــە فـــەرمانی ئەمپەراتۆر "یوستینین" کە هێمای کۆتایی سەدەی زانایی یۆنان و دەسپێکی سەردەمی تاریکییە. |
| ناوەراســـتی ســـــــەدەی سێنزەهەم | "تۆمـــاس ئاکۆینـــاس"، شـــرۆڤەکانی لـــە ســـەر "ئەرەستۆ" دەنووسێت.<br>سەردەمی وانەوتنەوەی فەلسەفە. |
| ١٤٥٣ ز | رووخانی بیزانس بە دەستی تورکەکان، کۆتایی سەردەمی ئەمپەراتۆریای بیزانس. |
| ١٤٩٢ ز | "کریـــستوف کولۆمـــب" بـــۆ ئـــەمریکا دەڕوات.<br>ســـەردەمی ژیانـــەوە لـــە شـــاری فلـــۆرانس و زیندووبوونەوەی زانایی یۆنان. |
| ١٥٤٣ ز | "کۆپـــەرنیك" کتـــێبی "ســـەبارەت بـــە ســـوڕی گـــۆ ئاسمانیـــەکان" بـــڵاو دەکاتـــەوە، لـــە روانگـــەی بیرکاریـــەوە سـەلماندی کـە زەوی بـە دەوری خـۆر دەسوڕێتەوە. |
| ١٦٢٣ ز | کڵێسا گالیلۆی ناچار کرد کە بە فەرمی حاشا لە بیرۆکەی ناوەندی خۆر بکات. |

| | |
|---|---|
| ١٦٤١ ز | دیکارت کتێبی "بیرکردنەوە بە قووڵی" بڵاو دەکاتەوە. دەسپێکی سەردەمی فەلسەفەی مۆدێرن. |
| ١٦٧٧ ز | کتێبی "ئەخلاق"ەکەی "ئەسپینۆزا" پاش مردنی مۆڵەتی چاپی پێدەدرێت. |
| ١٦٨٧ ز | "نیوتۆن" کتێبی "بنەماکان" چاپ دەکاتو تیایدا واتای "راکێشان" شرۆڤە دەکات. |
| ١٧١٠ ز | "لاك" نامیلکەی "نامەیەك سەبارەت بە ژیری مرۆڤ" بڵاو دەکاتەوەو بنەمای ئەزموون بەرەو سنورە نوێیەکان دەبات. |
| ١٧١٦ ز | مردنی لایبنیتس. |
| ١٧٣٩ بۆ ١٧٤٠ | "هیوٚم" نامیلکەی "نامەیەك لە سروشتی مرۆڤ دا" بڵاو دەکاتەوە، بنەمای ئەزموون تا سنورە لۆژیکیەکەی بەرەو پێش دەبات. |
| ١٧٨١ ز | "کانت" کە بە هۆی "هیوٚم" لە "خەوی چەقبەستووی خۆی هوشیار دەبێتەوە"، کتێبی "رەخنەی ژیری رەسەن" بڵاو دەکاتەوە. سەردەمی شکۆداری متافیزیای ئەڵمانیا دەست پێدەکات. |
| ١٨٠٧ ز | "هگێڵ" کتێبی "دیاردەناسی زەین" بڵاو دەکاتەوە کە لوتکەی متافیزیای ئەڵمانیایە. |
| ١٨١٨ ز | "شۆپێنهاوێر" کتێبی "جیهان بە واتای ئیرادەو |

| | |
|---|---|
| | پەرچدانەوە"ی بڵاو کردەوە: هەروەها فەلسەفەی هیندووستان لە متافیزیای ئەڵمانیادا بڵاو دەکاتەوە. |
| ١٨٨٩ ز | "نیچە" لە شاری "تورێن" ئەم رستەیە راگەیاندو تووشی تێکچوونی دەروونی بوو: "خوا مردووە". |
| ١٩٢١ ز | "ویتگنێشتاین" نامیلکەی "نامەی لۆژیکی و فەلسەفی"یەکەی خۆی بڵاو دەکاتەوە، شێلگێرە لە سەر ئەوە کە تیایدا "دوایین رێگاکانی" مەسەلە فەلسەفیەکانی بە دەست هێناوە. |
| دەیەی ١٩٢٠ ز | گروپی "ڤیەننا"، پەرە بە پوزیتیڤیزمی لۆژیکی دەدەن. |
| ١٩٢٧ ز | "هایدگەر" کتێبی "هەبوون و کات"ی چاپ کرد کە باسی جیایی نێوان فەلسەفەی شیکاری و فەلسەفەی ئەوروپی سەردەمی بەربەرییەت دەکات. |
| ١٩٤٣ ز | "سارت" بە بڵاوکردنەوەی کتێبی "هەبوون و کات"، بیرۆکەکانی "هایدگەر"ی تەواو کردو فەلسەفەی ئەگزیستانزیالیزمی خستەڕوو. |
| ١٩٥٣ ز | بڵاوکردنەوەی کتێبی "لێکۆڵنەوە فەلسەفیەکان"ی ویتگێنشتاین پاش مردنی خۆی. سەردەمی لوتکەی شیکردنەوەی زمان. |

زنجیرە کتێبی
ناسینی فەیلەسوفەکان

- نیچە
- سوقرات
- ئەرستۆ
- ئەفلاتوون
- ئیسپینۆزا
- ئاکویناس
- ئاگوستین قەدیس
- دیکارت ✓
- سارتەر
- کیرکگور
- ئەنیشتاین
- هیگڵ
- هیوم
- ماکیاڤیلی
- لایبنیتس
- لاک

سمایە

## زنجیرە ناسینی فەیلەسوفەکان

ناسینی فەیلەسوفەکان زنجیرەیەکە لە ژیانی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانو دەرگایەکی کراوەیە بۆ ناسینی بیروڕاو روانگەکانیان. لە هەر کتێبێك لەم زنجیرەیەدا جیا لە خستەڕووی زانیاری سەبارەت بە ژیانی فەیلەسوفەکان، بیرو بۆچوونی هەر فەیلەسوفێك لە پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەدا دەوترێتەوەو هاو ئاراستەیە لەگەڵ رووداو و گۆڕانکارییە هزریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی سەردەمی خۆیاندا. گرنگترین بیری فەیلەسوفەکان بە زمانێکی سادەو روون باس کراوە لە هەمان کاتیشدا لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی فەلسەفی وەرگیراوەو وردبینیەکی باشی لە سەر بووە. تازەپێگەیشتوانو گەنجانو هەموو خوێنەران کە فەلسەفەیان بەلاوە چێژبەخشە ئەم کتێبانە دەتوانێ هاوڕێو یارمەتیدەرێکی باش بێت بۆ جۆری بیرکردنەوەکانی. رەنگە ببێتە دەسپێکێك بۆ ئاڵوگۆڕ لە ژیاندا.




کۆشك
فرانتس کافکا
بەم زوانە...